شێخ موسڵحەدین سەعدی شیرازی

# گوڵستان

وەرگێڕانی:
زەکی ئەحمەد هەناری



شێخ موسڵحەدین سەعدی شیرازی

# گوڵستان

وەرگێڕانی:

زەکی ئەحمەد هەناری

پێداچوونەوەی:

غەریب پشدەری



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

هەولێر - هەرێمی کوردستانی عێراق

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
شەقامی گوڵان - هەولێر
هەرێمی کوردستانی عێراق
هەگبەی ئەلیکترۆنی aras@araspress.com
وارگەی ئینتەرنێت www.araspublishers.com
تەلەفۆن: 35 49 224 66 (0) 00964
دەزگای ئاراس لە ٢٨ تشرین (٢) ١٩٩٨ هاتووەتە دامەزران

شێخ موسڵحەدین سەعدی شیرازی
گوڵستان
وەرگێڕانی: زەکی ئەحمەد هەناری
پێداچوونەوەی: غەریب پشدەری
کتێبی ئاراس ژمارە: ١٢٤٨
چاپی یەکەم ٢٠١٢
تیراژ: ٦٠٠ دانە
چاپخانەی ئاراس - هەولێر
ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ١٨٧- ٢٠١٢
نەخشاندنی ناوەوە: زیاد تاریق
ڕازاندنەوەی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل، تریسکە ئەحمەد

ژێنگ:
ژمارەی پێوانەییی ناودەوڵەتیی کتێب
ISBN: 978-9966-487-15-7

# ناساندن

## سەعدی دانەری پەڕتووک[1]

سەعدی ناوی "موشەرەف کوڕی شێخ موسڵحەدین"ە؛ لە شاری شیراز پایەتەختی هەرێمی (فارس)ی ئەوکاتە، لە ساڵی (٥٨٩)ی کۆچیدا هاتووەتە دنیاوە؛ بۆیە هەر بە "شیرازی" بانگ کراوە.

هۆزی باوکی وەکو هۆزی دایکی لە بنەماڵەیەکی ئاینی و زانستی بووە. ناوبراویش هەر لەسەر ڕێچکەی هۆزەکەی خۆی ڕۆیشتووە و زانستە سەرەتاییەکانی لە باوکی و ئەوانەی وەک باوکیەوە فێر بووە.

سەعدی، یادی ئەو تاڵی و سوێری و هەناسەساردییانەی هەتیوی، کە هەر لە منداڵییەوە چێشتبووی هەرگیز لێی جیا نەدەبووەوە.

"موسڵحەدین"ی باوکی کە لەلای (ئەتا بەگ سەعدی کوڕی زەنگی سلغری) فەرمانڕەوای فارسدا کاروباری بۆ هەڵدەسووڕاند، مرد.

پاش مردنی "موسڵحەدین" فەرمانڕەوا باڵی باوکایەتیی بەسەر (سەعدی)دا گرت و لەسەر ئەرکی خۆی بۆ پەرەپێدان و دوایی‌هێنانی خوێندنی، سەعدی ناردە سوختەخانەی "نیزامییە" لە بەغدایە.

دوای تەواوکردنی خوێندن، "سەعدی" گەڕایەوە "شیراز"ێ؛ پاشان هێندەی پێ

---

١. ئەو سەرچاوانەی کە ئەم ناساندنەی لێ وەرگیراوە، ئەمانەن:

أ- گۆواری (تراث الانسانية)- المجلد الثاني - ١٠- سنة ١٩٦٤. ب - المنجد.

ج - فەرهەنگی نەو، دانەر: حسن عميد.

d. The Gulistan _ OR _Rose GARDEN of SA' DI _ TRASLATED BY EDWARD REHATSEK

هـ- الروضة او "گلستان سعدي الشيرازي": ترجمه د. محمد موسى هنداوي الى العربية.

و- ئینسیکلۆپیدی ئینگلیزی. ز- دائرة المعارف الاسلامية.

نەچوو بۆ گەشت و گەڕانێ (شیراز)ی بەجێ هێشتەوە.

لە ساڵی (٦٢٣)ی کۆچیدا لەبەر ئاڵۆزی و پەشێویی خۆی و تێکچوونی هەرێمی فارس و مردنی فەرمانڕەوای چاودێری "سەعدی کوڕی زەنگی" شیرازی بەجێ هێشت و هاتە دەرێ. - پێ دەچێ دایکیشی هەر پێش ئەم چوونە دەرەوەی مردبێ.- بۆ ماوەی ٣٠ ساڵ دەستی بە گەشت و گەڕانێ کرد.

لەو ماوەیەدا عێراق و حیجاز و شام و یەمەن و ئاسیای بچووک و ئەفەریقیای باکوری بەلای رۆژئاوادا و کیشوەرانی تری وەک هیند، ئێران، خوراسان و تورکستان و پشتی جەیحوون بەلای رۆژئاواوەی سەر لێ دا؛ ژنی لە یەمەن و شامدا هێناوە، منداڵێکی لە یەمەندا بووە و مردووە، نەزانراوە هیچ منداڵی تری هەبووبێ، شار و وڵاتانێکی ئیسلامی نەماوە نەیدیبێ.

لەم گەشتەیدا "سەعدی" بەرگی دەروێشی و گەڕیدەیی پۆشیوە.

بە ئامۆژگار (واعظ) و شاعیر ناسرابوو، بەهۆی بڵاوبوونەوەی هۆنراوەکانی لە جیهانی ئیسلامدا - بەتایبەتی رۆژهەڵات - بە ناوی (سەعدی) کە نازناوی - خامە PEN- NAME بوو، ناودار و ناسراو بوو. ئەم نازناوەشی سەبارەت بە چاکە و ئەمەکداریی خۆی بۆ فەرمانڕەوا "سەعدی کوڕی زەنگی" تا ببێتە یادگارێک بۆی، لە خۆی ناوە.

لە ساڵی (٦٥٤)ی کۆچیدا گەڕایەوە شیراز، کە کەوتە ناو ساڵانەوە هەر لە شیرازدا مایەوە و کەوتە سەر پەیڕەویی سۆفیگەریەتی "طریقة التصوف". هەروا نزیکەی ٣٠ ساڵانی تەمەنی پڕ بەها و بەنرخی خۆی بە ئاین و ئامۆژگاریکردن و شیعر دانانەوە بەسەربرد. لەم ماوەیەدا جارجارە نەبێ کە بۆ حەج چووەتە مەککە دەنا لە شیراز نەهاتووەتەوە دەرێ.

سەرەڕای ئەمەش ١٢ ساڵانی تەمەنی و ژیانیشی لە نان و ئاودانی بە ڕێبوارانداتێ پەڕاندووە و یەک لە مریدەکانی "شێخ عەبدولقادری گەیلانی"ش، بووە.

ئەم مرۆیە خواییە بەرزە بەهێزە، ئەم شاعیرە گیان سۆزە بەڕێزە ئەم ئامۆژگاریکارە زانایە دڵسۆزە، پاش ئەم هەموو تاڵی و سەنگەساری و رەنج و ئازار و دیلی و هەناسەساردییە کە بۆ بەرژەوەندی و باشە و چاکەی گشتیی

ئادەمیزاد ژیانی خۆی تەرخان کردبوو، لە ساڵی (٦٩١)ی کۆچیدا بە دڵێکی پڕ ئارام و ئاسوودە و هێمنەوە گیانی پاکی بۆ بارەگای بەرزی یەزدان - بۆ بەهەشتی بەرین، پەروازی فەرموو، لە تەمەنی "١٠٢" ساڵیدا لە شیراز کەوتە شیرین خەوی هەمیشەییەوە.

لەناو باغەکەی خۆیدا کە خۆی دای مەزراندبوو، بە خاک سپێردرا - خوای هەرە بەرز و مەزن بیخاتە ژێر باڵی دڵسۆزی و بەزەیی خۆیەوە، ئینشاڵڵا!

ئێستاکێ سەعدی لە شیراز، ئارامگایەکی پڕ درەخت و ئاوداری هەیە و هەر کەسێک کە بچێتە شیراز سەرێک لە ئارامگایەکەی ئەدا و سەری گەورایەتی و ڕێزی بۆ نزم دەکات و دادەنەوێنێ.

بە تێکڕایی: سەعدیی لەخۆبووردەی خۆنەویست ژیانی دوور و درێژی بەم جۆرە دابەش کراوە:

أ- "٣٠" ساڵ لە خوێندن.

ب- "٣٠" ساڵ لە گەشت و گەڕان.

ج- "٣٠" ساڵ لە پەیڕەویی تەریقەی سۆفیگەریەتی.

د- "١٢" ساڵیشی لە نان و ئاو پێدانی ڕێبوارانداا تێ پەڕاند.

لە شاکارەکانی سەعدی، پەرتووکی "گوڵستان" و "بۆستان" و گەلێک پەرتووکی تریەتی، کە هەمووی لەژێر ناوی "کوللیات" وەک دیوانێک کۆ کراونەتەوە؛ ئەم پەرتووکانەش باشترین و نایابترین شوێنەواری وێژەیی فارسییەتی کە بەجێی هێشتووە. بەتایبەتی پەرتووکی "گوڵستان" و "بۆستان"ی.

گوڵستان لە ساڵی (٦٥٦) کۆچییەوە تا ساڵی (١٣٦٥) کۆچی کە ئەکاتە (٧٠٩) ساڵ، لە هەموو کیشوەری ئیسلامدا ئەخوێندرا.

ئەوەی هۆنراوەکانی "گوڵستان" و "بۆستان"ی لەبەر بوایە و لە جێی خۆیدا، لە گفتوگۆیاندا، بیخوێندبایەوە بە تێگەیشتوو و خوێندەوار و ئایندار، ئەژمێردرا.

پەرتووکی گوڵستان و بۆستان بۆ سەر گەلێک زمانی زیندوو وەرگێڕدراوە. خاوەند مێژووی ژیان، هەروەکو (دەوڵەت شا) ئەڵێ؛ لە هەرە شاعیرە ناودارەکانی

فارسه و؛ یەک لە سێ

"سەعدی" لە هەڵبەست. فیردەوسی[1] لە چیرۆک و پێداهەڵگوتن و، ئەنوەری[2] لە چامە.

وەرگێڕ
کۆ: ١٩٦٦/١٢/٧

---

١. فیردەوسی = ناوی "ئەبول قاسم"ە، گەورەترین هۆنەرەوانی ئێرانە لە پێداهەڵگوتندا و، چیرۆکە زۆر ناودارەکەی، پەڕتووکی "شانامە"ی کە (٦٠,٠٠٠) شێست هەزار خانەیە (بەیت) بە ٣٥ ساڵ دایناوە لە ساڵی ٤١٦ی کۆچیدا مردووە، لە (طوس) کە شاری خۆیەتی نێژراوە.

٢. ئەنوەری یا ئیبوردی - ناوی "ئەوحەدەدین عەلی کوڕی ئیسحاق"ە یەک لە هۆنەرەوانە گەورەکانی ئێرانە؛ لە سەردەمی سوڵتان "سنجەر"دا چامەکانی زۆر ناودار بوون، لە ساڵی ٥٧٥ی کۆچیدا مردووە.

وەرگێڕ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## " دیباجە"

درووود بۆ خوای بەهێز و گەورەیە؛ کە بەندایەتی هۆی نزیکبوونەوەیە و لە سوپاسیا ئاسایش و خۆشییە، هەر هەناسێکی هەڵی ئەکێشی درێژکەرەوەی ژینە، کە ئەشیدەیتەوە حەسانەوەی گیان و گەشەی خۆتە. لەبەرئەوەی هەر هەناسەیەکیش دوو خۆشیی تێدایە بۆ هەر خۆشییەکی سوپاسێک پێویستە.

خانە

لەدەست و دەمی هی کێ، کام کەسێ

دێت.. بێنێتە جێ ڕەوای سوپاسێ

فەرمایشی خوای گەورە: "اعملوا آل داود شكراً وقليل من عبادي الشكور".

واتە: "بنەماڵەی داود سوپاس بکەن، لە بەندەکانی من سوپاسگوزار زۆر کەمن."

پارچە

بەندە وا چاکە لە کۆتایی خۆی

پۆزش بۆ دەرگای خوداوەند بێنێ

دەنا بۆ ئەوەی شایستەی خوا بێ

هیچ کەس ناتوانێ بەجێی بهێنێ

بارانی ڕەحمەتی بێ ئەژمار هەموو کەسێکی گرتووەتەوە، خوانی هەموو چەشنە نیعمەتەکانی بێ درێغ لە هەموو جێیەکدا ڕاخراوە، پەردەی نامووسی بەندانی بە تاوانی لە سنوور بەدەری نەدڕیوە و بژێوی مووچە خۆرانی بەسووچ و گوناهی ناشایستە نەبڕیوە.

پارچە

ئەی بەخشندە تۆ، لە گەنجی پەنهان
گاور[1] و تەرسا[2] رزقیان پێ ئەدەی
دۆستەکانی خۆت چۆن ئەکەی بێ بەش
کە تۆ دوژمنان وا چاو لێ ئەکەی

بە فەراشی بای وەشتی گوت: "رایەخی زومەرڕەدین رایەخی و بە دایانی هەوری بەهاریشی فەرموو: "کیژانی گیاو گوڵ لە بێشکەی زەویدا، پەروەردەبکا". درەختان بەرگی نەورۆزی و کەوای ئاوریشمیان پۆشیوە و منداڵانی لق بەهاتنی وەرز و کژی بەهار کڵاوی غونچەیان، لەسەرناوە. شیرەی ترێ بەتواناییە خۆی لە هەنگوینی تێپەڕاندووە و ناوکی خورماش بەگوێرەی پیرۆزییە گەورەبوونێی، بوویتە دارخورمایەکی بڵند.

پارچە

هەور و با، مانگ، رۆژ.. ئاسمان لەکارن
هەتاکو نانێ پەیدا بکەیت و بەغەفڵەت نەیخۆی
گشتی سەرگەشتە و ملکەچ فەرمانن...
رەوای هەق نییە، ملکەچ نەبی بۆی

وا ئەگێرنەوە لە سەروەری هەبووان و مایەی شانازی ئافەریدەکراوان و خۆشەویستی جیهانیان و دەستە گوڵی بژاردەی ئادەمیان و چەرخ و فەلەکی دوا سووڕی کات و زەمانان، ئەحمەدی هەڵبژاردە "محەممەد موستەفا" درودی خوای لێبێ.

---

١. گاور... مەبەست، زەردەشتییە.
٢. تەرسا... مەبەست، مەسیحییە.

خانه

تکاکار، ملکەچ، سپاردەی بەبەخش
توند و تۆڵ، ڕووخۆش، قەشەنگ و خۆش بەش

هۆنراو[٣]

بەرزی و بەڕێزی، گــــەیشـــــتنە پایە
بەجـوانیـیـەکـەی خـۆی، تاری[٤] لادایە
گشت خوو ڕەوشتی هەمووی، هەرباشن
بۆ خـــــــۆ و بۆ نـەوەی، بکـەن تکـایە

هەر کاتێ یەکێک لەبەندە گوناهکارەکانی پەشێوی ڕۆژگار، دەستی پاڕانەوە و پەشـیمـانی بـە ئومـێدی وەڵامـدانەوەی بەرەو قـاپی یەزدانی گەورە بـەرز بکاتەوە و ئەویش ڕووی نەداتێ و وەڵامی نـەداتەوە، دووبارە هـانای بۆ بەرێتـەوەو هـاواری لێ بکاتەوە و هەمـدیس ڕووی تێ نەکاتەوە ئەوجا بە نـاورانەوە و پاڕانەوە و لاڵانەوەوە هاواری تێبـەستێ، یەزدانی پاک و بەرز، ئەفـەرمووێ: فـریشتـەکانم! لە بەندەکەم شـەرمەزار بوومەوە، تە نیا من نەبێ کەسی تری نییـە، ئەوا لێی خۆش بووم، واتە وەرامی داواکەیم دایەوە، تکایەکەیم کـەیاندە جێ... کە لە تکای زۆر و ناورانەوەی بەندان شەرم دەمگرێ و تەریق دەبمەوە.

خانه

بنواڕە بەخـشش و نەرمی کـردگـار
گـوناه بەندە دەیکات و ئەو شـەرمـەزار

گۆشـە نشـینانی کـابەی جـەلالی ددانیـان بە تەواو نەپەرسـتنی خـوادا ناوە و گوتوویانە "مـاعبدناک حق عبـادتک" ستایش گۆیانی زێوەری جوانی بە واقی وڕەوە

---

٣. ئەم هۆنراوە عەرەبی بوو، بۆیە خستمانە ناو دوو کەوانە لەمە بەدوا، هەرچی لە ناو دوو کەوانەدا بوو، عەرەبی بووە.

٤. تاریکی

ئەڵێن "ما عرفناك حق معرفتك" واتە.. نەمانناسیوی وەک شایستەی ناسینیت.

پارچە

گەر کەسێک باسی ئەو لەمن پرسێ
بۆ ناساندنی، سەرسام چ بکا دیار
عاشقان کوشتەی مەعشووقانیانن
نە دەنگ لە کوشتە، دێت و نە هاوار

خواپەرستێکی خاوەن دڵ سەری بەیەخەی خۆیدا بەردابووەوە و کەوتبووە دنیای خۆیەوە و لە دەریای گەڕان و دۆزینەوەی راستییەکاندا نقوم بووبوو، کە بێدار بووەوە یەکێک لە ئاواڵەکانی هەروا بەگاڵتەوە پێی گوت: "لەم باغ و بێستانەی کە تێیدا بووی چ دیارییەکی گەورەت بۆ هێناوینەوە؟" وەرامی دایەوە: "وام لە دڵدا بوو کە گەیشتمە داری گوڵ، دامەنی لێ پڕکەم و بەدیاری بۆ هاودەمانی بێنمەوە، بەڵام هەرکە گەیشتمە دارگوڵ، بۆنی گوڵ وای مەست کردم کە دامەنم لە دەست بەربوو."

خانە

گـوتم با گـوڵێک بڕنم لـە باغی
هەرکە گوڵم دیت، مەست بووم لە بۆنی

پارچە

مەلی سپێدە! عیشق لە پەروانە فێربە
کە سووتا و گیانی دا و دەنگی لێ نەهات
ئەوانەی لە رێی عیشقا جانبازن..
لە بێ خەبەران، کەشکەک سەلاوات

پارچە

ئەی بەرزتر لە خەیاڵ و ئەندازە و گومان و وەهم
هەرچی دەربارەت گـــوترابێ لامـــــە
مـــەجلیس تەواو بوو و تەمـــەن دوایی هات
ئەقڵی هەموومان لەبارەی تۆوە پووچ و کاڵفامە

لە چاکەی پادشای ئیسلامدا - خوا وڵاتی بەرقەرارکا یاد و بیرەوەرییە، جوانەکانی سەعدی کە کەوتوونەتە سەرزاری خەڵکی، ناوبانگی وتارەکانی کە بە پانتایی زەویدا بڵاو بووەتەوە و ڕۆیشتووە وشە دڵکێشەکانی کە وەردەگرن وەک قامیشی شەکر شیرینییەکەی دەخۆن و پارچە نووسراوەکانی وەکو پارچە زێڕ هەڵدەگرن لە گەورەیی و ڕەوانبێژیی خۆیەوە نییە، بەڵکو خاوەنی جیهان و قوتبی زەمان و جێنشینی سولەیمان و یاریدەری باوەڕداران، شاهەنشای مەزن "ئەتابەکی گەورە"سالاری هەردوو جیهان "ئەبوبەکر کوڕی سەعدی زەنگی" خوای لێ ڕازی بێ بە چاوی خۆشەویستییەوە ئاوڕی لێ داوەتەوە و سەیری کردووە و پەسندی فەرمووە و خۆشی ویستووە، هەموو کەسێکی رەش و ڕووتیش دڵیان بۆ خۆشەویستیی ئەم ڕۆیشتووە کە "الناس علی دین ملوکهم" واتە، خەڵکی لەسەر ئاینی پاشایەکانی خۆیانن.

چوارینە

لەو کاتەوە کە چاوت، لە منی قەلەندەرە
کەرخم لە ناوبانگی هەتاوا، زۆرتر بەدەرە
گەرچی هەموو چەشنە عەیبێکم، لە دەورەو لەبەرە
هەر عەیبێکی کە شا پەسندی بکا، هونەرە

پارچە

قوڕێکی بۆن خۆش، ڕۆژێک لە گەرماو
لەلای دڵدارێک، گەیشتە دەستم

لێم پرسی کــه تۆ، مــسکی.. عــەبیــری؟؟
کـــەوا لە بۆنی بۆنخـــۆشــیت، مـــەســـتم
وەرامــی داوە قـــــــــــــورەی هــیــچ، بــۆم
کـاتێک لەگـەڵ گـوڵ، دانیـشـتم، خـسـتم
کـــەمــــاڵی هاودەم، کــــاری تێ کــــردم
دەنا هەر ئەو قـورەم، بێ کـەڵک و پەسـتم[1]

خوایا!! موسڵمانان بەژیانی درێژی بەرخوردار کەی و تەمەن و پاداشی چاکە و بەخشینیشی دوو چەندان کەیت و پلەی مووچە خۆران و دۆستانی بـەرز ڕاگری و دوژمنانیشی بفەوتێنی بۆ خاتری ئایەتی قورئانی خـوایا!! وڵات و مـەملەکەتی لە مەترسییان دوورخەیتەوەو بە دووری کەیت و منداڵەکانی بپارێزی.

هۆنراوە

جیهان بەوەوە خۆشە، هەر خۆش بێ
خـوا پاڵپشـتی بێ و ئـاڵای پیـرۆزی
براله کـە دەڕوێ، ئەوە.. ڕەگـەکـەی
لە چاکـەی تۆمــە، داری ناو کــۆزی

یەزدانی بەرز و پاک و بێبــاک، ئەم وڵاتی شــیــرازە بە ڕووەتی فــەرمــانداری دادپەروەرەوە و بە هـیـمـەتی زانایانی کـارایەوە تا ڕۆژی قـیـامــەتێ بێ ترس و لە خۆشیدا بپارێزی.

پارچە

نـازانی کـــە من لە وڵاتی غــــوربەت
بۆچ ژینی دنیــام، خــســتــە درەنگی؟
لە تەنگەی تورکا[2]، چوومـە دەر کە دیم
جیهان ئاڵۆزبوو، هەروەک مووی زەنگی

---

١. پەستم: کەمترم.
٢. تەنگەی تورکان: دەربەندی تورکان

هـەمـــــــوو ئـادەمـی زاد بـوون و بـەڵام
وەک گورگی خوێنخۆر، بەتیژی چەنگی
کـــە گـــەڕامـــەوە، وڵات هـێـــمنە، دیم
پڵنگان بەریان داوە، خـــووی پڵـــەنگی
لە ژوور کـــەسـێکن، فـــریشـــتـــە دیمەن
لەدەر لەشکرن، شـــێـــرانی جـــەنگی
بەم جـــۆرە دەوری، پێـشین بوو کـــە دیم
جیهان پڕ ئاشووب، پەشێو بوو، تەنگی
وابوو ســـەردەمـی، پاشـــای دادپـەروەر
"ئەتـابەگ بەکـر کـوڕ ســـەعـدی زەنگی"

پارچە

هـەرێمـی پارس لـە غـــەم و ئـازار، نیـــیـــە باکی
تا لـە ژێر چاوەدێری تۆ دابێ، ئەی ســایەی خـــودا!!
ئێـــمـرۆ لـە هـەمـوو ڕوویـی زەویدا، کـــەس نیـیـــە بێ
چەشنی ئاستانەیی دەرگەت، کە خـەڵک لێی بێ ڕەزا
پاسـی دڵی بیـــمـــاران لەســـەر تۆیـە و ســـوپاســـیش
لەســەر ئێـمـە و لای خـودای جیـهـان - ئـافـەرین سـزا
خـــودایا!! خـــاکی پـارس، لە ئـاشـــووب بپـــارێزی
هـەتاکـــو خـــاک خـــاکـــە و ئـاویش هـەر ئـاو، مـــا

### هۆی دانانی پەرتووکەکە

شەوێک، بۆ ڕۆژانی ڕابوردووی خۆمم بیر دەکردەوە و غەمم لە تەمەنی بەفیڕۆچووی خۆم ئەخوارد، بەردی بناغەی خانیچکۆلەی دڵمم بە ئەڵماسی فرمێسکی چاو کون ئەکرد، ئەو هەڵبەستانەی مناسبی حاڵی خۆمم ئەوتن:

دوو تاکی

هەردەم لە تەمەن، پشووێکمان ئەڕوا
وەک ورد ئەبمەوە، هێندەمان نەما

ئەی ئەوەی پەنجات ڕۆیی و هەر نووستی
گەر بەو پێنج ڕۆژە، پێ ڕاگەی؛ هەستی!!

شەرمەزار ئەمە، کە ڕۆیی بێ کار
کە تەپڵی ڕۆیین لێدرا، نەیبێ بار

خەوی شیرینی، سبەینەی ڕۆیین
بە ڕێ ڕاناگا، پیادەی خەوشیرین

هەرکەس هات خانووی، نوێی کرد بنیات
ڕۆیشت، یەکێ تر بۆ ناو خانوو هات

هەروا ئەم خانووەی، بەسەر نەبرد کەس
ئەوەی مایەوە، بۆ خۆشی و هەوەس

مەبە بە دۆستی یاری بێ بڕیار
قەت بە دۆست ناشێ، بەدی ستەمکار

مایەی ژینی پیاو، ڕەنگە بە ڕاستی
تا لە سەر خۆیە، بە تەندروستی

گــەر ببــەســتــرێ، كــە نەكــرێتــەوە
دڵ لە ژین بەردە، بەخـــۆشــــیـــتـــەوە

یان بكرێتـــەوە، هیچ شت نەیبـــەســتی
بڵێ لە ژینی، با بشــــوا دەســــــتی

چوار خووی دژ بەیەك، سەركێش ناهەموار
چەند ڕۆژ بە خـــۆشی، ئەژین لە یەكـبــار

گــەر ســەر بكەوێ، یەكــێك لەم چوارە[1]
گــــیـــــان دەرئەچێ، لە لەش ناچارە

بێگومـــــان یەكــــێك، دانابێ پڕ ژیر
نە دڵ ئەخـــاتە ســـەر دنیـــا، نە بیــر

چاك و خــراپ ئەبێ، هەر بمرێ كــاكــە
خەنی لەو كـەســەی، بردی گـۆی چاكـە

چاكەی خـۆت پێش خۆت، بۆ گـۆڕ بنێرە
دوای خـۆت كـەس چاكـەت، ناهێننە ئێرە

تەمــــەن وەك بەفـــــرە، هەتاوی هـاوین
دەیتـــوێنێـــتـــەوە و كـــۆتایی دێ ژین

دەســــتكورتی نەدار، كـــە ئەچیـــە بازاڕ!
ترسم لەوەیە، پڕنەكـــەی دەســــمـــــار[2]

ئەوەی دەســتـچێنی، خـۆی نەخـوا كـامـرۆ
كـاتی دروێنە، مـەگـەر گــوڵ كـا، كـۆ

---

١. ئەم چوار شتانە: خاك و ئاو و هەوا و ئاگرە.

٢. دەسمار: دەسماڵ – غەریب –.

پەندەکەی سەعدی، ببیە و لەبەرکە
ئەوە ڕێگایە و مەرد بە گوزەرکە

پاش وردبوونەوەم لەم بارەیەوە وام بەباش و بەرژەوەند زانی بەتەنیا لە گۆشەیەک دانیشم و لە هاودەم و ئاواڵ و دۆستانم بپسێمەوە و دەفتەر لە وتەی پەرت و بڵاو و بێ جێ پاک کەمەوە و لێرە بە دواوە وتەی لەوچڕ نەڵێم.

خانە

زمان بەستە، لە کونجێکی دانیشم لاڵ و کەڕ
لەو کەسە چاکترە، کە زمانی لەدەست ئەچێتە دەر

تا یەکێک لە هاونشینەکانی نێو کەژاوەو دیوەخانێم، لێم وەڕوورکەوت و وەک جاران کەوتە گەنجەفە و دەمەتەقێ و قسەی خۆش، من وەڵامیم هەرنەدایەوە. سەرم لە سەر ئەژنۆی خواپەرستییە هەڵنەگرت. بە دڵێکی شکاوەوە سەیرێکی کرد و گوتی:

پارچە

کاتێ دەتوانی، پڕ بە دەم بدوێی
بدوێ براله بەلوتف و خۆشی
سبەینێ ئەجەل، کە پەیکی هەنارد
ناچاری زمان، بستێ دەرکێشی

یەکێ لە ئاواڵەکانم پێی گوت: سەعدی بڕیاری گۆشەگیری و بێدەنگی داوە و دەیەوێ و ئارەزوویەتی، ئەوەندە ماوەی ژیانی ئاوا بە خامۆشی و کزی و بێدەنگی بەسەر بەرێ.

جا تۆش، گەر ئەتەوێ و لە تواناتدایە، ئەو ڕێگایەی ئەو بگرە و پێیدا ڕابڕە و پەیڕەوی ئەو بکە.

وەڵامی دایەوەو گوتی: سوێند بەوەی دنیای داناوە و بەقورئانی پیرۆز دەم ناکەمەوە و هەنگاوێک نانێم، چونکە ئازاردانی دڵی دۆستان گێلی و نەزانی و کەودەنییە و کەفارەتی سوێندیش سانایە.

بیروڕای هۆشمەندان پێچەوانەی ڕێی ڕاست و شکانی پەیمانی ئاقڵمەندانە؛ شمشیری عەلی لە کالان و زمان لە زاری سەعدیدا ڕاوەستێ.

پارچە

زمـــان لە زاری هۆشـــیـــارا، چیـیــە؟
کلیلـی گـــــەنجی، خـــــاوەن هـونەرە

لەو دیو دەرگـاوە، چووزانی کـەسێک...
گـەوهـەر فـرۆشـە یا شـووشـەگـەرە[1]

پارچە

گـەرچی بێدەنگی لە پێش دانایان، مانای ئەدەبە
کاتی پێویستی دەبێ بۆ گوتن، گورج تێکۆشی
عـــــەقڵ لە دوو شت تووڕەیە، هـەر دووش...
بێدەنگی، کاتی گوتن و گوتنیش، کاتی خامۆشی

بەکورتییەکەی نەمتوانی خۆم ڕاگرم و زمان لە دواندنیا بگێڕمەوە و بە پیاوەتیم نەزانی خـۆم مـات کـەم و ڕوو لە گـفـتـوگـۆی وەرگـێـڕم. چونکە یاری هاوبیر و دۆستێکی ڕاست بوو.

خانە

کە ویستت لەگەڵ کەسێ بجەنگی بە توانا و بەهێز
بەناچاری بۆی، وەرە مـــەیدانێ، یا بکە گـــوڕێز

بەناچاری کـەوتمەوە دواندنی، بۆ ڕابواردن و گـەشت و سـەیرانێ چووینەوە دەرێ، بەهار دەرو دەشـتی کـردبووە بەهەشت، سـەرما دەقی شکابوو و کـاتی فەرمان و دەوڵەتمەداری گوڵ بوو.

---

١. شووشە فرۆشە.

خانە

کــراسـی ســەوز، لەبەر درەخـــتـــان
وەک جلی جـەژنە، لەبەر خۆشبـەخـتـان

پارچە

سەری ئۆردیبەهەشت، مـانگی جـەلالی
بـولبـــولی گـــۆینـدە، لە بەرزی لکـان
لەسـەر گوڵی سـوور، خوناوی سـوورتاف
وەک ئارەق لە رووی، شـــەرمـنی جـــوان

وا رێک کەوت، شەوێک لە نێو باغ و بێستان، لەگەڵ یەک لە دۆستان نووستین، جـێگەیەکی خـۆش و خـوڕڕەم، درەخـتـەکـانی دڵکێش و بەرهەم، وەک بڵـێی بەوردە مینا خاکەکەی داڕێژراوە، هێشووە ترێ بەدار مێوێدا شۆڕ بووەتەوە.

پارچە

(باغــێکە ئاوی جـۆگـای شـیـرینە
شـابـاڵی شـیـعـری، مـەلانی مـەوزوون)
ئـەو پـڕ لـەلالـەی، رەنـگـاو رەنـگـیـنـە
ئەم پڕ لە مـیـوەی، بـاشی گـونـاگـون
(با) لە ژێر ســایەی، درەخـــتـــەکـانی
رایخـسـت ڕایەخی، رازاوەی گـوڵگوون

بەیانی کـە بیـری گـەڕانەوە لە نـاخـمـدا تاوی سـەند، دیم دامـەنی پڕ لە گـوڵ و رەیحان و سونبول و دەمیران کردووە و ئارەزووی گەڕانەوەی شار دەکا.
پێم گوت: گوڵی گوڵزار هەروەک دەزانی بەقای بۆ نییە و نە پەیمانی گوڵستانیش وەفـای بۆ هەیە.. دانایان گـوتـوویانە: "هـەرچی زۆر نـەمـێنێـتـەوە شـایانی دڵ پێوەبوونی نییە".
گوتی: چار چییـە؟. گوتم: "بۆ تـەمـاشـای تەمـاشـاکاران و خـۆشکردنی دڵان و

گەشانەوەی ڕووان، ئەتوانم پەڕتووکەکی "گوڵستان" دانێم کە نە بای پایز دەستی بەلق و پۆپ و گەڵا و گوڵی ڕابگا و نە سووڕانی گەردوون بتوانێ خۆشی بەهاری لێ بکاتە ماتەمی پایز.

دوو تاکی

سەبەتەیەک گوڵ، چ کەڵکت دەگرێ

لە گوڵستانی من، تۆ ببە پەڕێ

گوڵ هەموو مانی پێنج ڕۆژ و شەشە

ئەم گوڵستانە، هەمیشە گەشە

کە ئەمەم گوت.. دامەن و کۆشە گوڵەکەی بەردا و دامەنی گرتم و گوتی:

"پیاو کە گفتی دا بە جێی ئەهێنێ". وا ڕێکەوت لەو ڕۆژانەدا هێندێکم لە باسی خۆشگوزەرانی و شێوازی قسە و گفتوگۆوە نووسیبوو کە ئەگەر باش بەکار بهێنرێت ڕەوانبێژی و زمان پاراوی پێ پەرە دەستێنێ.

هێشتا گوڵی نێو گوڵزار کەمێکی مابوو، کە پەڕتووکی گوڵستان تەواو بوو. ئەوکاتەش کۆتاییی دێت و تەواو دەبێ کە لە دەرگای بارەگای جیهانپەنا و، سایەی پەروەردگار و لوتفی پڕتەوی کردگار، شای زەمان و گەنجینەی ئەمان (پەنا بەهاوکاری ئاسمان دراو، زاڵبووی سەر دوژمنان، بازووی دەوڵەت تێکشکێن، چرای پڕشنگداری میللەت، جوانە پیاوی نێو پیاوان، شانازی ئیسلامان "سەعدی کوڕی ئەتابەکی مەزن، شاهەنشای گەورە، خاوەن گەردەنی میللەتان، گەورەی پاشایانی عەرەب و عەجەمان، سوڵتانی تەڕ و وشکانی، میراتگری موڵکی سولەیمان، سەرکەوتووی دنیاو دین "ئەبوبەکری کوڕی سەعدی کوڕی زەنگی" یەزدان بەخت و ئیقباڵی هەردووکیان بەردەوام و مەزنایەتییان دووچەندان بکا و سەرەنجامیان بە هەموو چاکەیەک بگەیەنێ لە ڕووی لوتف و بەنازی خۆشەویستی پاشایەتییەوە تەماشای بکات و سەری پێدا بفەرمووێت.

پارچە

گەر ئاورێک لە شا، جوانی کربیایە
ئەبووە توحفەی چین، نەقشی ئەرژەنگی[1]
ئومێدم وایە، بێزاری نەدا
گوڵستانێکە، نەک جێی دڵتەنگی
باخوسوس کرا، دیباچەی بیرۆز
بەناوی "سەعدی بو بەکری زەنگی"
لە گەورەیی خوو و ڕەوشتی فەرمانڕەوای دادپەروەر
فەرمانڕەوا "فەخرەددین" خوا هەر بەبەرزی بیهێڵێتەوە

کیژی بووکی بیری من لەبەر ناشیرینییەی سەرشۆڕە و چاوی نائومێدییەی لەبەر شەرمنییەی لەسەر پشتی پێی هەڵنابڕێت و لەناو دەستەی پیاوانی خوادا ئاراستە نابێ، مەگەر ملوانکەی نەخشینی قبووڵی شازادەی گەورە و زانای دادپەروەر و خاوەن هێزو دەسەڵات و ڕاوێژکەری راوێژی وڵات و پەنای بێگانان و داڵدەدەری هەژاران و فەریاد ڕەسی ئیسلام و موسڵمانان و جێ متمانەی پاشایان و سوڵتانانەوە "ئەبوبەکر کوڕی ئەبونەسر" مەوەی بکرێتە گەردەن. خوا تەمەنی درێژ و ڕووەتی گەورەتر و سینەی خاوێن و پاداشی دوو هێندە بکا.

خانە

هەر کەس لە سایەی ئەو، خۆشەویستە
گوناهی تاعەت، دوژمنی دۆستە

بۆ هەریەک لە نۆکەران و دەستەی خزمەتکاران ئیشێکی داناوە کە لە جێبەجێ کردنی لایەنێکی ئەم ئیشەدا یەکێک سستی و شل و پەیتی کرد لێیان بتۆزێتەوە و گلە و گازەندەیان لێ بکرێ، تەنیا دەستەی دەروێشان نەبێ، کە سوپاسی نیعمەتی

---

١. ئەرژەنگ: ئەرتەنگ: پەڕتووکێکی (مانی)یە کە گەلێک نەخش و نیگاری تێدا بووە بەهۆی ئەمەوە داوای پێغەمبەرایەتیی دەکرد.

گەورانیان لەسەر پێویستە داوای چاکەیان بۆ بکەن.

بەجێگەیاندنی ئەم جۆرە خزمەتە لە پاشەملەوە باشترە نەک لە ڕوو. چونکە لە ڕووبەڕمابییەوە دوورە.

## پارچە

پشتە کوورەکەی ئاسمان لەخۆشییان، قیت بۆوە
لەم کاتەی دایکی زەمانە، ڕۆڵەی وەک تۆی هێناوە

حیکمەتێکی خالیسە بۆ، لوتفی پەروەردگار
ئەم بەندەیەی بۆ خزمەتی، قەومی خۆی کە داناوە

ئەو کەسە بەختیارە، بە ناوێکی باش ژیا
بەیادی باشی دوای خۆیەوە زیندووە و بەناوە

مەدحی تۆ ئەگەر بکەن یا نەکەن، ئەهلی فەزڵ
پێویستی بە جوانکار نییە، ڕووی جوان و ڕازاوە

## پۆزش هێنانەوە لە کۆتاکردنی خزمەت
## و
## هۆی هەڵبژاردنی گۆشەنشینی

بەکۆتاهێنان و کەمتەرخەمی لە درێژەپێدان و بەردەوامیی خزمەتی لە بارەگای پاشایەتیدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە دەستەیەک لە زانا و دانایانی هیندستان لەبارەی زانایی و هونەروەری "بوزەر جومەهر"ەوە ئەدوان، لە دواییدا تەنیا ئەم عەیبە نەبێ کە گران گۆیە و زۆر بە درەنگەوە قسان دەکات و گوێگر دەبێ زۆر چاوەڕوان بێ، دەنا هیچ شتێکی تریان لێ نەدیتەوە. کە "بوزەرجومەهر" گوێی لەمە بوو گوتی: "ورد بوونەوە و ڕاوەستان لەسەر ئەوەی چ بڵێم، باشترە لە پەشیمانبوونەوەی کە بۆچ گوتم"

دوو تاکی

قسەزانێکی جیهان زۆر دیتوو
باش بەراوردی ئەکا، دەمودوو[1]
بێ ڕامان مەدە، تۆ لە وتن.. دەم
ئەتۆ چاک بڵێ، با درەنگ بێ، چ غەم؟

بەبەراوردبە، ئەوجا بکە قسە
ئەوەندە مەڵێ، پێت بڵێن بەسە
ئادەمی بەوە لە چوارپێ جیایە
چاک بڵێ بەو زمانەی، لە دەمیدایە

چۆن لەبەرچاوی گەورە پیاوانی دەرگای پاشادا، کە جێی کۆبوونەوەی خاوەن

---

١. دەمودوو: قسەوقسەکردن: گفتوگۆ

دڵان و ناوەند و مەڵبەندی زانایانە سینگی خۆم ڕەپێش دەکەم و پاڵەوانەتیی دەنوێنم و لە سنووری ئەدەب ئەچمە دەرەوە چونکە ئەمە سەرکەشییە و کەم هێنانە بۆ بازاڕی گەوهەرفرۆشان و لەوێشدا ئەو کەمە دەنکە جۆیەکی ناهێنێ، چرا لەبەر هەتاوێ ڕووناکی نییە و منارەی بڵند لە دامێنی کێوی ئەلوەندا نەوی دیارە.

دوو تاکی

ئەوەی لەبۆ شەڕ، بەرزۆکا گەردەن
دوژمن لەسەدلا، هێرشی بۆ ئەبەن

"سەعدی" کەسێکە، کەوتوو و ئازادە[1]
هیچ کەس نایەتە، جەنگی ئوفتادە[2]

یەکەم تێڕامان، ئینجاکێ گوتار
بناغە پێشدان، پاشینێ دیوار

پیشەم گوڵچنیە، نەک لە گوڵستان
دڵدارم گەرچی، دوورم لە کەنعان.

بە لوقمانی دانایان گوت: "دانایی لە کێوە فێر بوویت؟
گوتی: "لە کوێران، کە هەتا جێ پێیەک نەدۆزنەوە، پێ دانانێن؛"
"هاتنە دەرەوە، پێش چوونە ژوورەوە"

نیو هۆنراوە

پیاوەتیت تاقی کەوە، ئینجا ژن بێنە

پارچە

گەرچی ئازایە، کەڵەشێر لە جەنگ
چی ئەکا لە پێش، بازی ئاسن چەنگ

---

١. پیرێکی بەخشراو.
٢. کەوتوو.

پشیله شێری، مەیدانی مشکە
مشکیش شێرێکە، بۆ شێرو پڵەنگ

بە پشتیوانیی خوو و ڕەوشتی باش و بەرفراوانی گەوران، کە چاو لە کەموکووڕیی ژێردەستان و بەردەستان دەپۆشن و بۆ بڵاوکردنەوەی تاوانی بچووکان تێ ناکۆشن، چەند وشەیەکم بە کورتی لە وشەی بێ هاوتا و نایاب و چیرۆکە هەڵبەست و سەرگوزەشتە و ڕەوشتی پاشایانی پێشوو، تێدا پێچایەوە و بەشێکیشم لە تەمەنی گرانبەهای خۆم تێدا بەخت کرد، کە بووە مایەی ڕێکخستنی پەرتووکی "گوڵستان" - پشت بە خوا.

پارچە

ئەمێنێ ساڵەها، ئەم ڕێکوپێکە
کە گەردی خاکی ئێمە، وا لەلایێ

مەبەستم شوێنەوارێکە، دوای خۆم بمێنێ
کە نابینم ژیان هەیبێ، بەقایێ

مەگەر پیاوێکی خوا، ڕۆژێ بەرەحمەت
بکا، بۆ کاری دەروێشان دوعایێ

وردبوونەوە لە ڕێکوپێکیی پەرتووکەکە و پاککردنەوەی بەر و بەردەرگەکانی و کورتکردنەوەی وتەکانی پەسند کران، تا بووە ئەم "گوڵستان"ە پڕ سوود و بەکەڵک و پڕ ئاوازە و بووە باغێکی چڕوپڕی وەک باغی بەهەشت.

هەشت دەرگەی تێدا کرایەوە، هەر بۆیەش وا کورت کرایەوە، تا بێزاری و وەڕەزی لێ نەکەوێتەوە...

پەنا بەخوا بۆ دوایی پێهێنانی

## دوو تاکی

ئەو دەمــەی ئێـمــە کـە یەکـجــار خــۆش بوو
(کــۆچی) شــەش ســەد و پەنجــاو شــەش بوو

ئامــۆژگــارییــە مـــەبەســـتـمــــان، لەوا[1]
ئێـــمــــە هـەر ئەڕۆین، ســـا پەنا بە خـــوا

***

دەرگەی یەکەم: لە ڕەوشتی پاشایان
دەرگەی دووەم: لە خوو و ڕەوشتی دەروێشان.
دەرگەی سێیەم: لە گەورەییی قەنیات (قەناعەت) ەوە.
دەرگەی چوارەم: لە سوودەکانی بێدەنگی (خامۆشی).
دەرگەی پێنجەم: لە ئەوین و لاوێتی.
دەرگەی شەشەم: لە بێ تینی و پیری.
دەرگەی حەوتەم: لە سوودی بەخێوکردن (پەروەردە)
دەرگەی هەشتەم: لە شێوازی هەڵسوکەوتی ژیانەوە.

---

١. لەوا: لەودا.

دەرگەی یەکەم

# لە ڕەوشتی پاشایان

١- سەرگوزەشتە

بیستم پاشایەک ئامـاژەی بە کوشتنی دیلێک کرد، دیلی بێ دەرەتان لە نائومێدییاندا بەو زمانەی دەیزانی جنێوی پێ بە پاشا دا و نەفرەتی لێ کرد، گوتراوە:

خانە

هەرکەسێ دەستی لە گیانی بشوا

بە زمـانی دادێ، چی لە دڵیـدا

هۆنراو

(کە نائومید بوو مرۆڤ، ئەوسا درێژ دەبێ زمانی

وەک پشیلەی تەنگەتاو، هێرش ئەباتە سەر سەگ)

خانە

کە نائومێدێک نەی ما، ڕێی فیرار

دەست بۆ شیر دەبا، بدا پەلامار

پاشا پرسی، ئەمە چی ئەڵێ، یەکێک لە شالیار (وەزیر) ە باشەکانی وەڵامی دایەوە:

گەورەم!! ئەڵێ: "والکاظمین الغیظ، والعافین عن الناس، والله یحب المحسنین" واتە: "ئەوانەی ڕقی خۆیان ئەخۆنەوە و خەڵکی دەبەخشن خوا پیاوچاکانی خۆش

دەوێن و لێیان دەبوورێ.

پاشا دڵی نەرم بوو و بەزەیی پێدا هاتەوە و چاوی لە کوشتنێی پۆشی.

وەزیرەکەی تر دژی ئەو وەزیرەیان بوو گوتی: "بۆ هاوڕەگەزانی ئێمە، جوان نییە لە راستی بەولاوە لە ڕووی پاشایاندا، هیچی تر بڵێن، ئەمە جنێوی بە پاشا دا و ناماقووڵیی کرد؛ پاشا بەم وتەیە گرژ بوو و گوتی:

"درۆی ئەومان زۆر لا پەسندترە، لەو ڕاستییەی کە تۆ گوتت، چونکە درۆیەکەی ئەو ڕووی لە کەڵک و ئاسایشە و راستییەکەی ئەم ڕوو لە ناپاکی".

دانایان گوتوویانە: "درۆی کەڵک ئامێز، زۆر چاکترە لە ڕاستییەکی فیتنە ئەنگێز."

خانە

ئەو کەسەی کە شا، بەقسەی ئەکا.. ئەم

حەیفە هەر باشە نەڵێ، هەموو دەم

ئەم وتە خۆشەش لەسەر تاقی هەیوانی "فەرەیدوون" نووسرابووەوە:

دوو تاکی

جیهان نامێنی، براله بۆ هیچ کەس

بە پەروەردگار دڵ بەستە بە و بەس

بەموڵکی دنیا، تۆ مەبەستە پشت

زۆر کەسی وەک تۆی، پێگەیاند و کوشت

کە بانگی ڕۆیین ئەدا.. گیانی پاک

وەک یەکە، مردن لەسەر تەخت یا خاک

٢- سەرگوزشتە

یەکێک لە پاشایانی خوراسان، سوڵتان مەحمودی سەبوکتەگینی پاش مردنی بەسەد ساڵان، لە خەودا دیت کە هەموو ئەندامەکانی لەشی دارزابوو و بووبووە

خاک، تەنیا چاوەکانی نەبێ کە هەروا لە قوڵتی چاویدا ئەگەڕان و ئەیانڕوانی.

هەموو دانایان لە لێکدانەوەی ئەم خەونە، سەرسام مان، تەنیا دەروێشێک نەبێ، لێکدانەوەی ئەم خەونەی زانی و گوتی: "ئێستاش چاوی لەوە ئەگێڕێ کە موڵکەکانی بەدەست کەسانی ترەوەیە.

هەڵبەست

ناوداران گەلێک، نێژران لە ژێرخاک
نیشانەی بوونیان، لە گۆڕێ نەما
ئەم لاشە پیرە، کە سپێررا بە خاک
خاک وەهای خوارد، ئێسکیشی نەما

بەعەدلە ناوی نەوشیروان ماوە
لەمێژە "نۆشی - رەوان"[1]ی نەما
خێر بکە و تەمەن، بە هەل بژمێرە
پێش ئەوەی بڵێن، فڵانی نەما

٣- سەرگوزەشتە

بیستم پاشازادەیەک کە باڵا کورت و بچکۆلە بوو، برایەکانی هەموو باڵا بەرز و جوان و لێوەشاوە بوون، جارێکیان پاشا بە رووگرژی و بە سووکی سەیری کرد. کوڕە بە هۆش و گۆش و وریا بوو، تێگەیی و گوتی:

باوکە کورتە بنەیەکی ژیر و مەند باشترە لە نەزانی بەژن و باڵا بڵند، وانییە هەرکەسێک کە بەباڵا درێژترە بەنرخیش چاکترە، کە "الشاة نظیفة والفیل جیفة" واتە: بەرخ پاکە و دەخورێ و فیل مردارە و ناخورێ.

هۆنراو

(لە هەموو کێوی دنیایە بچووکتر، توورە[2]
کەچی لای خودا پایە بەرز و پڕ نوورە)

---

١. (نۆشی ـ ڕەوان): گیانی شیرین.

٢. توور = چیای طور

پارچە

ئەوەت بیستووە!!.. لەڕێکی دانا
وتی.. بە شێتێ، گۆشتن و قەڵەو

ئەسپی عارەبی، هەرچەند (لەڕ)یش بێ
لە ڕەوکە کەرێک، هەر چاترە ئەو

پارچە

هەتاکو مرۆ نەیەتە دووان
عەیب و هونەری ونە و کەس نەزان

گومان وا مەبە، دارستان چۆڵە
ڕەنگە پڵنگێک خۆی، لێدابێ پەنهان

لەو کاتەدا بیستم دوژمنێکی دژوار ڕووی لە پاشا کرد، کە لەشکری هەردوولا ڕوویان تێک کرد و بۆیەک هاتنەدەر و ڕیزیان بەست، یەکەم کەس کە ئەسپی بەرەو مەیدانی لینگ دا، ئەو کوڕە بوو و ئەیگوت:

پارچە

من لەوانە نیم، پشت دەم ڕۆژی جەنگ
منم ئەبینی، سەر بە خوێن و خاک
جەنگاوەر وازی، ئەکا بە گیانی
پشتدان ڕۆژی جەنگ، مەرگە بۆ لاو چاک.

ئەگێڕنەوە کە سوپای دوژمن بێ ئەژمار بوو و ئەوانیش کەم، کۆمەڵێک لەوانە ویستیان هەڵێن، کوڕە دەنگی دان و گوتی: "مێران!! تێکۆشن تا کراسی ژنان نەپۆشن" سوارەکان بە تانەو تەشەرەکانی ئەو غیرەتیان بزووتەوە و بە یەکجار هەڵمەتیان بردە سەر دوژمن، بیستمەوە کە هەر ئەو ڕۆژە بەسەر دوژمندا سەرکەوتن.

پاشا ئەملاولای کوڕەی ماچ کرد و لە ڕۆخە خۆی دانا و تا دەهات پێشچاوتری ئەخست، هەتا کردیە جێنشینی دوای خۆی.

برایەکانی حەسوودییان پێ برد، ژەهریان بۆ لە خواردنێ کرد، خوشکی لە ژوورێوەرا چاوی لێ بوو و پەنجەرەکانی پێک دادا، کوڕە بە زیرەکیی خۆی تێ گەیشت و دەستی لە خواردنەکە کێشایەوە و گوتی: "هەرگیز نابێ هونەرداران بمرن و بێ هونەران جێیان بگرنەوە."

خانە

کەس نایەتە ژێر، سایەی کوندەبۆ

هوماش لە جیهان، بیبڕێ پەلوپۆ

باوکەکە لەم کارەیان ئاگەدار بووەوە، برایەکانی بانگ کردن؛ گوێ ڕاکێشانێکی جانانەی کردن، پاشان بۆ هەر یەکێکیانی لەلایەکی وڵاتیەوە بەشێک بۆ دانان هەتا فیتنە دامرکا و کێشمەکێش خامۆش بوو و گوتراوە:

"دە دەروێش لەژێر کلیمێکدا ئەترنجێن، دوو پاشا لە وڵاتێکدا ناگونجێن".

پارچە

نیوە نانێ گەریخوا، پیاوی خودا

ئەیداتە دەروێشێک، نیوەکەی تری

حەوت هەرێم داگیر بکا، پاشایەک

گرتنی یەکی دی، دەیدا لەسەری

٤- سەرگوزەشتە

تاقمە دزێکی عارەبان لەسەر کێوێک خۆیان گرتبووەوە و ڕێی کاروانیان گرتبوو، دانیشتوانی وڵات ترسیان لێ نیشتبوو و لەشکری پاشاش خۆی بۆ نەدەگرتن و پێیان نەدەوێرا، چونکە دەجێیەکی قایم و قوللەی کێوێکیدا بوون و کردبوویانە پەنا و بنەگەی خۆیان.

دانا و زانایانی وڵات، بۆ دوور خستنەوەی شەڕی ئەمانە کەوتنە ڕاوێژ و ڕاوێژکارییە، کە ئەگەر ئەم تاقمە ئاوا لەسەر ئەم بارەیان بمێننەوە، بەربەرەکانێیان ناکرێ.

دوو تاکی

دارێک لە جێیەک، تازە بنێژرێ
بەتاکەکەسێک، سووک هەڵ ئەکێشرێ

هەروا بەم جۆرە، لێی گەڕێی ماوەک
هەڵناکێشرێتۆ، بە تۆ و بە فەلەک

دەکرێ سەرچاوێک، بیگری بەبێلێک
کە پڕ بوو ناگری، بەری بە فیلێک

وایان بڕیاردا لێیان بخەفتن و چاوەدێرییان بکەن تا هەلێک هەڵدەکەوێ و بۆ پەلامار و جەردەییە لە شاخی دێنە خوارێ و جێیەکەیان چۆڵ دەکەن و بۆ ئەمەش چەند پیاوێکی بەکار و جەنگ دیتە بنێردرێ و لە کەلێن و کەلەبەری نێو شاخیدا خۆ بشارنەوە. شەو کە دزەکان لە تالان و بڕۆیە گەڕانەوە و کەلوپەل و ماڵی تالانیان دانا و چەکیان لە خۆ داڕنی، هەروا بەشێک لە شەوێ تێپەڕیبوو، یەکەمین دوژمن کە پەلاماری دان و هێرشی بردنە سەرێ، خەو بوو.

خانە

ڕووی ڕۆژ بزر بوو، کەوتە تاریکی
یونسی قووت دا، نەهەنگ بە چاکی

مەردانی پاڵەوان لە حەشارگاکانیانەوە دەرپەڕینە دەرێ و هەستان قۆڵ و باسکی یەکە یەکەی دزەکانیان بەست، بەیانی هەموو لە دەرگای پاشادا وەستان، پاشا فەرمانی بەکوشتنی هەر هەموویان دا.

وا ڕێک کەوت لاوێکیان لەناودا بوو کە تازە دەهات پێدەگەیشت، تازە خەتی

سمێڵێی دابوو، یەک لە وەزیرەکان پێچکەی تەختی پاشای ماچ کرد و ڕووی تکای لە زەوی خشاند و گوتی:

"ئەم کوڕە هێشتا لە باغی ژیاندا بەرخۆرە نەبووە، لەلاوەتییە خۆی بەرخوردار نییە، هیوام بە بەخشندەیی و ڕەوشتی بەرزی پاشایەتیت بە بەخشینی خوێنی ئەم لاوە منەتی چاکەیەکی وا لە ئەستۆی ئێمە بخەن"

پاشا ڕووی لەم قسەیە گرژ کرد و دەگەڵ بیروڕای ویدا ڕێک نەهاتەوەو گوتی:

خانە

هەرگیز نابێتە پیاو، ئەوەی بنیاتی بەدە
تەربیەتی ناکەسان، گوێزی سەر گونبەدە

بڕینەوەی ڕەگەز و تۆرەمەی ئەوانە و ڕیشەکێشکردنی ڕەگی بنەماڵەی ئەوانە تا پەلەی لێ بکرێ باشتر و بەکەڵکترە، چونکە ئاگر کوژاندنەوەو پشکۆ بەجێهێشتن، و مارکوشتن و بێچووە مار بەخێوکردن کاری دانایان نییە.

پارچە

هەور گەر ئاوی، ژیان ببارێنێ
لە ترۆپکی دارێ، هەرگیز بەر ناخۆی
بۆ پیاوی سووک، کات مەدۆڕێنە
لە قامیشی زەل، قەت شەکەر ناخۆی

وەزیر کە ئەم قسەیەی بیست - خۆشی و ناخۆشی - سەلماندی و ئافەرینی لە گرژینەوەی باشی پاشا کرد و، گوتی: هەرچی پاشا - خوا بەرقەراری کا - فەرموویان ڕاستە، کارێکە و بێ وەرامە و ڕاستە.

ڕاستییەکەی ئەوەیە کە هەرچەندە ئەو کوڕە چووەتە سەر ڕێی پیاوخراپان و سروشتی ئەوانی وەرگرتووە و بووەتە یەکێک لەوان، بەڵام ئومێدەوارم دەگەڵ چاکاندا خووی چاکە بگرێ و هۆشیارانە پەروەردە بێ و هیواداریشم چونکە جارێ منداڵە و خوو و ڕەوشتی سەرکێشی و یاغییەتی ئەو کۆمەڵەی لە ناخ و دەروونیدا نەڕوا و تێیدا نەچەسپابێ.

لە فەرمووددا هاتووە "ئەوەی لە دایک دەبێ، لەسەر سروشتی سادەی خۆی لە دایک دەبێ، پاشان دایک و باوکی دەیکەن بە جوو یا بە تەرسا[1] یا بەگاور"[2].

کوڕی نوح کە بووە، دۆستی بەدکاران

پێغەمبەریەتی، هۆزەکەی ون کرد

سەگی یارانی ئەشکەوت، چەند ڕۆژێ

لەگەڵ پیاوچاکان، ناوبانگی دەرکرد

ئەمەی گوت و کۆمەڵێک لە هاوددمەکانی پاشا، پشتیان گرت، تا پاشا لە خوێنی ئەوەیانی چاوپۆشی کرد و گوتی: "وا بەخشیم هەرچەندە کەڵکێکیش لەمەدا نابینم"

٥- چوارینە

دەزانی کە زاڵ چی گوت بە ڕۆستەم

نابێ بژمێری، دوژمنت بە کەم

دیومە جۆگەلەی سەرچاوەی زۆر چووک

حوشتری بردووە، کە بووە بە چەم

لە ئەنجامدا کوڕەیان زۆر بەناز و خۆشییەوە پەروەردە کرد و بۆ فێرکردنی پێویستییەکانی دیوانی پاشا، مامۆستایان بۆ دانا، تا وای لێ هات بووە جێ پەسندی هەمووان.

ڕۆژێک وەزیر لەبارەی کوڕەکەوە کەمێک بۆ پاشا دوا و گوتی:

"کە پەروەردەی زانایانی وەرگرتووە و نەزانیی کۆنی لە سروشتیدا دەرچووە و خووی هۆشمەندانی گرتووە، پاشا بەم وتەیە گرژییەوە و گوتی:

---

١. تەرسا: دیان، مەسیحی.

٢. گاور: مەجووسی.

پارچە

(بەشیری ئێمە گەورە بووی
کێ پێی گوتی، گورگ زادەی
سروشتێک بناغەی بەدبێ
بەکەس لەو ڕێیەی لا نادەی)

خانە

عاقیبەت ئەبتەوە گورگ، گورگزادە
با لای ئادەمییانیش گەورە بووبێ و ئامادە

دوو ساڵ بەسەر ئەم کارەدا تێپەڕی، دەستەیەک دز و دروزنی گەڕەکێ پێوەندییان لەگەڵا پەیدا کرد و بەڵێنیان لەگەڵ بەست لە هەلێکدا وەزیر و هەردوو کوڕەکەیان کوشت، سامان و داراییەکی بێ ئەژماریشیان برد و چوون لە ئەشکەوتی دزان لە جێی بابی لێی دانیشتەوە و کەوتەوە ڕاو و ڕووتکردن و یاغیبوونێ، پاشا پەنجەی پەشیمانییەی بە ددان گەست و گوتی:

پارچە

شمشیری چاک لە ئاسنی خراپ، ناکرێ بەکەس
ناکەس بە پەروەردە نابتە کەس، ئەی دانایان
باران کە لە نەرمی سروشتیدا خیلافێک نییە
لە باغان گوڵ دەڕوێنێ و دڕک لە شۆرەزاران

پارچە

زەویی شۆرە، دەغڵ و دانی لێ نابێ
مەدۆڕێنە لەوێ، بەری ڕەنجی خۆت

چاکە لەگەڵ خراپاندا بکەی، وەهایە
وەک خراپە لەگەڵ چاکان بکەی، خۆت.

٥- سەرگوزەشتە

سەرهەنگ زادەیەکم لە دەرگای سەرای "ئۆغلەمیش"دا دیت، کە زیرەکی و ژیری و هۆش و گۆش و تێگەیشتنی لەباسکردنێ بەدەر بوو هەر لە منداڵییەوە گەورەیی لە ناوچەوانی و تیشکی زیرەکییەی لە ڕووانڕا دیاربوو.

خانە

لە باڵای، سەری.. تڕووسکەی هۆشمەندی
دەدرەوشـێـتـەوە، سـتـێـرەی بڵـەندی

بە کورتی: کەوتە بەرچاو و دڵی پاشا، دیمەنی جوان و ڕەوشتی بەرزی یەکیان گرتبوو و ئاوێتەی یەکتری بوون، دانایان گوتوویانە:

"دەوڵەمەندی بە دڵە نەک بە ماڵ، گەورەییش بە ئەقڵە نەک بە ساڵ."

خانە

منداڵێک کـەوا، لە ژیرییـا پیـرە
لەلای هۆشـیاران، گـەورەی بە بیـرە

کوڕانی - ڕەگەزی لەسەر پلە و پایەکەی پێی هەڵ کاڵان و بەناهەقیان تاوانبار کرد و بۆ کوشتنی، زۆریان هەوڵی بێهوودە دا.

نیو هۆنراو

دوژمن چی دەکا، کە یار دڵسۆز بێ.

پاشا لێی پرسی: "هۆی دوژمنایەتیی ئەمانە چییە لە گەڵ تۆدا؟

گوتی: "لەسایەی سەری پاشاوە - خوا بەرقەراری کا - هەمووم ڕازی کردوون تەنیا حەسوودەکان نەبێ، کە بەنەمانی خۆشی و دارایی من نەبێ دڵیان داناکەوێ و ڕازی نابن. خۆشی و شادی دەوڵەتی پاشا هەر پایەداربێ.

پارچە

ئەتوانم دڵی کەس، نەدەم ئازار
چی لە حەسوودکەم، خۆی دڵ رەنجوورە
بمرە! ڕزگار بە لەم ئێشە، حەسوود
بە مەرگ نەبێ، دەربازیت دوورە

پارچە

دەغەزدار بە دڵ، ئەگا ئارەزوو
بەختەوەر نەبێ، هیچ پایە و مایە

شەمشەمەکوێرە، کە ڕۆژ نابینێ
گوناهی تیشکی خۆر، لە چ دایە
گەر ڕاستیت دەوێ، هەزار چاوی وا
کوێر بێ چاکترە، نەک ڕۆژ نەبوایە

٦- سەرگوزەشتە

لە پاشایەکی عەجەم دەگێڕنەوە، کە دەستدرێژیی دەکردە سەر ماڵ و موڵکی میللەت و زۆری و ستەمێکی ئەستووری بەسەر خەڵکیدا سەپاندبوو و زۆر مەردوم ئازار بوو. خەڵکەکە لە بێدەرەتانییان گیانیان بێزار بووبوو و لە تاوان ڕێی غەریبایەتییەیان گرت و هەڵاتن، کە میللەت لە کەمییەی دا و هیچی وای نەمایەوە دەرامەتی میریش لە کورتییەی دا و کەم بووەوە، خەزێنە بەتاڵ بوو و دوژمنانیشی لە هەموو لایەکەوە تینیان بۆ هێنا.

پارچە

ئەوەی لەشکری بوێ، ڕۆژی جەنگ
دەبێ سەخی بێ، ڕۆژانی ئاشتی

گـەر لەگـەڵ بـەندەت باش نەبـی، ئەڕوا
بە خـۆشـی.. دوژمن، ملکـەچە گشـتی

جارێک لە مەجلیسی ئەودا پەڕتووکی "شانامە" یان لەبارەی نەمانی کیشوەری "دەئاک = زوحـاک" و سـەردەمی فـەرمیدوونەوە ئەخـوێندەوە، وەزیر لە پاشـای پرسی:

"کە فـەرمیدوون گەنج و لاو و کەسـوکار و نۆکـەر و خزمـەتکاری نەبوون، ئەدی چۆنی فـەرمـانڕەوایی کیـشوەر گـرتە دەست"، گـوتی: خـەڵکێکی زۆر لایەنگیـر و پشتگیری بوون، یارمەتییان دا و هاریکارییان کرد و پاشایەتیی کەوتە دەست."

وەزیر گوتی: "گەورەم! لەبەرئەوەی پاڵ وێکدان و لێک خڕبوونەوەی خەڵکی و گەل و دەوروبەر مـایەی پاشایەتی و هۆی بەردەوامییـەیە ئەدی ئـەوە تۆ بۆچی بڵاوە بەو خەڵکە و گەلی ئەم وڵاتە ئەکەی، مەگەر بیری پاشایەتیکردنێت نییە؟

خانە
واچاکــە لەشکر، تۆ بە گــیـان بگری
شــا، کـە سـەروەرە، بەهۆی لەشـکری

پاشـا گوتی: جـا ئەوە چییـە کە سـوپا و میللەت کۆ دەکـاتەوە؟ گوتی: دەبێ پاشـا بەخـشندە بێ، هەتـا لێی کـۆببنەوە، هەروەها ئـەبێ دڵسـۆز و مـیـهـرەبـان بێ، تا لە سـایەی دەوڵەتیـدا بـە دڵنیـایی و ئاسـوودەییـیـەوە دانیـشن و تۆ لەم دووانـە هیچ یەکێکیانت نییە.

دوو تاکی
سـتـەم نابێـتـە، پیـشـەی سـوڵتـانی
لە گــورگ نایە، پیــشــەی شــوانی

پاشـایـەک، بەنـای زۆر[1] دامــەزرێنێ
بنـاغـەی مـوڵکی، خـۆی ئەڕووخـێنێ

---

١. بەنای زۆر: زوڵم و زۆری و ستەم.

پاشا ئامۆژگارییەکەی وەزیری ڕاوێژکاری بە دڵ نەبوو، بەو قسەیەی ڕوو گرژ بوو و خستیە زیندانێوە، هێندەی پێ نەچوو کە کوڕانی مامی لە بەرامبەری ڕاست بوونەوە و داوای کیشوەر و فەرمانڕەوایەتیی باوکیان کردەوە، ئەو هۆز و تیرە و خێڵانەی کە لەبەر زۆرداری و ستەم و دەستدرێژییەیش پەرت و بڵاو و چارس و بێزار بووبوون کۆبوونەوە و یاریدەی ئەوانەیان دا کە ڕاست بووبوونەوە، تا کیشوەری لە دەست هاتەوە دەرێ و بووەوە بە هی ئەمان.

پارچە

گەر شا لەگەڵ گەل نارەوایی کا

دۆستی دوژمنە، لە تەنگانەدا

دڵسۆزی گەل بە، بێباک لە دوژمن

گەل سوپای شایە، لەو کاتانەدا

٧- سەرگوزەشتە

شایەک لەگەڵ کوڕە عەجەمێکی لەناو کەشتییەدا، دانیشتبوو کوڕە دەریای نەدیتبوو، فێری ناوکەشتی و سەر سووڕەی دەریایە نەبووبوو، گریان و هاوار و داد و بڕۆی لێ هەستا، هەموو لەشی کەوتە لەرزین، چەندی لاواندیەوە و دڵخۆشی دایەوە کەڵکی نەگرت و ئارام نەبووەوە، ژیانی لە پاشا تاڵ کرد، چارەی نەما، نەیدەزانی چی لێ بکا.

دانایەک هەر لەو کەشتییەدا بوو کە ئەوانیشی تێدابوون، بە پاشای گوت: "ئەگەر بفەرمووی من بە ڕێگایەک ئەمە بێدەنگ ئەکەم.

پاشا گوتی: "ئەمە لوتفێکی گەورەیە".

دانا فەرمووی: "کوڕەکە باوێنە زەریاوە! چەند جارێکان نقووم بوو، خۆی بە دواوەی کەشتییەکەوە گرتەوە، کە ماوەیەک تێپەڕی و هێنایانەوە ناو کەشتییەکە دانیشت و لە گریان و هاتوهاوار کەوت و ژیر بووەوە.

پاشا ئەمەی بەلاوە خۆش بوو و گوتی: "ئەمە چ حیکمەتێکی تێدابوو؟ حەکیم گوتی: "یەکەم ترسی نقوومبوونی نەدیتبوو و نرخی سەلامەتییە ناو کەشتییەکەی

نەئەزانی، کەسێک نرخی دوایی شتێک دەزانێ کە دووچاری ئازار و ڕەنجی ئەو شتە هاتبێت.

پارچە

نانی جۆت لە زار، خۆش نییە کاکە
کەی دڵداری من، لای تۆ جوانە
لای حۆری بەهەشت ئەعراف[1] دۆزەخە
لای دۆزەخییان جێی ڕێزدارانە

خانە

ئەوەی کە یاری لە باوەش گرتووە، دیارە جیاوازە
لەگەڵ ئەو کەسەی کە چاوەڕوانی، یاری دڵخوازە

٨- سەرگوزەشتە

بە هۆرمزیان گوت، چ سووچ و تاوانێکت لە وەزیرەکانی باوکت دیت، کە هەموویانت خستە زیندانەوە، گوتی: "هیچم لێ نەدیون بەڵام سەیرم کرد منیان لە دڵدا نییە و بڕوایان بە فەرمانڕەوایی و سەردەمی من نییە.. ترسام لەوەی، کە لە ترسی گیانی خۆیان لە ناوم بەرن، لەبەر ئەمە ئەم کارەشم هەر لەسەر وتەی دانایان کرد کە گوتوویانە.

پارچە

لەوە بترسێ، کە لێت دەترسێ
با لە شەڕیشا، لەو بەهێزتربی
نابینی کتک کە هات تووڕە بوو
دەردێنێ چاوی پڵنگ یا شێربی

١. ئەعراف: شوێنێکە لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا، لای بەهەشتێ نزمترە لەلای دۆزەخێ، یانی لای دۆزەخێی بەرزترە لەلای بەهەشتێ...ـ غەریب –

مـــار بۆیە بە پێی، شـــوانەوە ئەدا
نەک بەردی دەسـتی بەسـەری فـێربی

٩- سەرگوزەشتە

یەکێک لە پاشایانی عەرەب لەبەر پیرییە دەینالاند و بە ئازار بوو، ئومێدی لە ژیان بڕیبوو، لە ناکاو سوارێک هات، موژدەی دایە و گوتی: "لەسایەی سەری پاشاوە (فلانە) قەلاتمان گرت و هەموو دوژمنەکانیشمان بە دیل گرت و ئێستاش هەموو سوپا و دانیشتوانی ئەو ولاتە ملکەچی فەرمانتانن.

پاشا هەناسـەیەکی ساردی هەڵکێشا و گوتی: "ئەم مژدەیە بۆ من نییـە، بۆ دوژمنانی منە کە دوای من دەبنە میراتگر و ولاتیان دەکەوێتە دەست.

پارچە

ئومـــێـدم نەمـــا، تەمـــەن تێـپـــەڕی
بەو هیـــوایەوە کـــە لە دڵمـــا بوو
هیوا هاتە جێ، بەلام سەد ئەفسووس
ئەو کـــاتەی خـــۆری تەمـــەن ئاوا بوو

پارچە

دەســـــتی کـــاتە و لە تەپڵی ســـــەفـــەری دا
ئەی چاوەکـــان بکەن مـــاڵئـــاوایی، لە ســـەر
ئێـوەش.. لەپی دەست و شـــان و قـــۆڵ و بازوو...
هەمـــوو لێکدی بکەن مـــاڵئـــاوایی یەکـــســـەر
تەمـــــەنو تێـــــپـــــەڕاند، بەلام بە نـادانی
من کـــــە نەمکرد، ئێـــــوە بکەن حـــــەزەر

١٠- سەرگوزەشتە

لە ژوورسـەری ئارامگای "یەحیا پێغەمبەر" سلاوی خوای لێ بێ - لە مزگەوتی (دیمەشق)دا گۆشەنشین بووم، یەکێک لە پاشا عەرەبەکان کە زۆر بەبێ ئینسافی

ناسرابوو، هاته زیارەتێ و نوێژی کرد و لە خوای خواست.

خانە

دەروێش و دارا، بەندەی ئەم خـــــــاک و دەرەن
خـۆ ئەوانەی کـە هەبووتریشـن، نیـازمـەندتەرەن

ئەو کـاتە ڕووی کـردە من و گـوتی: "بەهەقی هیـمـمـەتی دەروێشـان کـە ئێـرە جێیەتی و جێی راستی کردەوەیانە، بە دڵ منتان لە بیربێت و ئاوڕی خێرم لێ بدەنەوە، چونکە من لە دوژمنێکی دژوار دەترسم و لەبەری هەراسانم". پێم گوت "تۆ بۆ خۆت بەزەییت بەڕەشوڕووتی خۆتدا بێتەوە، تا لە دوژمنی خۆت هەراسان نەبی".

هەڵبەست

بەهێـــزی بازوو بە تێنی پەنجــــە
گـــوناهـە دەســـتی هەژار بشکێنی

ناترسێ ئەوەی خـێـر ناکا بە کـەس؟
کە کـەوت یارمـەتی لە کەس، نەبینی[1]

ئەوەی خـراپەی چاند، بە هیـوای چاکە
خـــەیاڵ پڵاوە، مــێــشکی نایهـێنی

تۆ گـوێت هەڵ بخــە بۆ دادی خــەڵکی
دەنا دادپـەروەر، دادی ئـەســـــــێنی

دوو تاکی

مـــرۆڤ ئەندامی، لەشی یەکـــتـــرن
لە دروســـتـبـــوونا، لە یەک جـەوهەرن

---

١. نەبینی: نەبینێ.. بەشێوەزاری کۆیە "نەبینی" نووسراوە.

ئەندامێک ڕۆژێ، کە کەوتە ئازار
ئەندامانی تر، نایان بێ قەرار

تۆ کە لە ئێشی، ئیدی[1] بێ غەمی
ناشێ ناویشت، بنێن ئادەمی؟

١١- سەرگوزەشتە

دەروێشێکی دوعا قبوڵ لە بەغدادا پەیدا بوو، "حەجاجی کوڕی یوسف" یان ئاگادار کرد، بانگی کرد و پێی گوت: "دوعایەکی باشم بۆ بکە"

دەروێش گوتی:

"خوایە: گیانی لێ بستێنە". گوتی: "لە ڕێی خوا! ئەمە چۆن دوعایەکە؟" گوتی: "ئەگەر تۆ بمری، خەڵکی لە ئازاری دەستی تۆ و تۆش لە گوناهان ڕزگارت دەبێ."

دوو تاکی

ئەی زەبر دەستی، ژێر دەستەی ئازار
تاکەی بمێنێ، وا گەرمە بازاڕ

بەکەڵکی چیت دێ، حوکمی زۆرداری
مردنت چاترە، لە خەڵک ئازاری

١٢- سەرگوزەشتە

یەکێک لەپاشا زۆرداره بێ ئینسافەکان، لە خواپەرستێکی پرسی: "کام عیبادەتە لە هەمووان باشترە؟" گوتی: "بۆ تۆ، نووستنی نیوەڕۆ، تا ئازاری کەس نەدەی."

پارچە

زۆردارێکم دیت، نیوەڕوان دەنووست
گوتم چاکترە، بنوێ ئەم فیتنە

---

١. ئیدی: کەسانی دی، مرۆڤی دی، خەڵکی دی.

خــەوی باشــتــرە، ئەو لە بێــداری
مـەرگی وا چاترە، سـەدجـار لەم ژینە

١٣- سەرگوزەشتە
بیستم پاشایەک، لە ڕابواردنێدا شـەوی کردبووە ڕۆژ و لەوپەڕی مەستیدا دەیگوت:

خانە
لەم کـاتەم خـۆشـتـر قـەت دەست ناکـەوێ
یەکم بەخێرو شەڕ و غەمی هیچ، کەسێ ناکەوێ.
دەروێشێک کە بە ڕووتی، لە دەرێ لەبەر سەرمایە نووستبوو، ئەمەی گوێ لێ بوو.

خانە
ئەی ئەوەی هیچ کـەس پایەی ئیـقـبـاڵی وەکـو تۆ نابێ
گریمان دڵت خۆشە و بێ غەمی، باشە ئەی غەمی ئێمەشت نابێ؟
پاشا پێی خۆش بوو، پڕێسکەیەکی هەزار دیناری لە پەنجەرەوە بۆ شۆڕ کردەوە و گوتی: "ها!! کۆشت بگرەوە".
دەروێش گوتی: "کۆشی چی؟ خۆ من کراسم لە بەردا نییە، پاشا زیاتری بەزەیی پێدا هاتەوە، دەستە جلێکیشی خستە پاڵ پڕێسکەکە و بۆ دەروێشی نارد.
دەروێش هـەر زوو و بە مـاوەیەکی کـەم هەمـوو ئەو پارەیەی بێـرەو بەوێدا دا و خواردی و ئەوجا هاتەوە.

خانە
ئارام ناگرێ مـاڵ، لە دەسـتی سـەخی پیـاو
وەک سەبر لە دڵی عاشق و وەک لە بێژنگ ئاو
کە پاشا دڵی ئەم قسـەیەی نەگرت هەر تێشیـان گەیاند کە فلانە دەروێش هـەروا ڕاوەستاوە، پاشا گرژ و مرچ و مۆن هەڵگەڕا، لێرەدا زیرەک و دانا و تێگەیشتووان

گوتوویانە، خۆت لە توندوتیژی پاشایان بپارێزە، جاری وایە بە سڵاوێک دەڕەنجێن و جاری واشە بە جنێوێک دەستە جلێک ئەبەخشن.

نیـعـمـەتی پاشـای، لێ ببێ حـەرام
ئەوەی کە دەرفەت لـە دەست دا تەمـام
تا جـێی قـسـانت، پێـشـدا نەبینی
قـەدری قسـەی خـۆت هەروا نـەچوێنی

پاشـا گوتی: ئەم گەدایە بێ پەروایە مـاڵ بەفیرۆدەرە کە ئەم هەموو بەخششـەی بەم مـاوە کـەمـە چواند، دەرکـەن. گـەنج و خـەزێنەی وڵاتی مـاڵی هەژارانـە، نەک خۆراکی برای شەیتانانە.

شێتە ئەوەی رۆژی رووناک، مۆم داگیرسێنێ
شەو کە هات بە زوویی، رۆن لە چرایدا نامێنێ

یەکێک لە وەزیرە راوێژکـارەکـان گوتی: "ئەی پاشـای سـەر رووی زەوی وام پێ چاکـە، ئەم چەشنە کـەسـانە هەر تەنیـا بـای بژێویی خـۆیـانیـان بە جـیـاجـیـا بۆ ببـڕدرێتەوە و بیـاندرێتێ، تا لـە بەرێوەچوونیـاندا دەسـتـبڵاوییـە نەکەن. بـەڵام کە فـەرمـووت دەری کـەن و هـیـچی مـەدەنێ و لێشی توورە بوویت، ئەوە کـاری خـاوەن هیمـەتان نییـە کە یەکێک بە خـۆت هیـوادارکـەیت و دوایەش بێ هـیـوا و نائومـێدی خۆتی کەی و دڵی بشکێنی.

خانە
دەرگـای سـەخـا مـەکـەوە، لە تەمـاعکار
کە کردتەوە، داخستنەوەی، دەبێتە دژوار

خانە
مەل ئەچتە جێیەک، کە لێی بێ چینە
ناچێـتـە جـێـیـەک، بیـێـتـە چینە.

پارچە

کەسێ نەیدیوە، تینووی ڕێی حەجێ
کۆزیلکەی بگرن، لە ڕۆخ ئاوی سوور[1]

لە کوێ هەڵقوڵێ، سەرچاوەی شیرین
لێی کۆ دەبتەوە، مرۆ و مەل و موور

١٤- سەرگوزەشتە

یەکێک لە پاشایانی پێشین، کەمتەرخەمی و سستی لە کاروباری وڵاتدا ئەکرد، لەگەڵ سوپا و قۆشەن و سەربازەکانیدا، توندوتیژ بوو، دوژمنێکی سەرسەختی لێ یاغی بوو. سوپا و قۆشەنی هەمووی پشتیان کردەوەو ڕوویان لە هەڵاتنێ نا.

دوو تاکی

ماڵت لە سوپا، درێغ بزانی
دەست نادەنە چەک، شێرە کوڕانی
شێرە کوڕ چ بکا لە ڕۆژی جەنگا
کە دەست بە تاڵ بێ، لە نانی ژیانی

لەگەڵ یەکێک لەوانەی کە غەدریان لە پاشا کرد، دۆست بووم، گلەیم لێ کرد و گوتم "سپڵەیی و هەق ناشوناسی و بێ ئەمەکییە کە هەر بە وردە گۆڕانێکی کەم لە گەورەکەی خۆی هەڵگەڕێتەوە و هەموو ئەو بەخششانەی کۆنی ساڵەهای ساڵی لە بیر بچێتەوە و وەلایانەوە بنێ، گوتی: "ببەخشە و بیانووەکەم لێ قبووڵ کە، ئەسپەکەم بێ ئالیک و جۆ بوو و زینەکەشی لە ڕەهندا بوو. پاشایەک بەزێڕ ڕژدی لەگەڵ سوپاکەیدا بکات، سوپاکەی بە گیان، چاوتێری و گیانبازی بۆ ناکا.

---

١. سووور: سوێر، شۆرەک.

خانە

زێڕ بدە سەرباز، تا گیان بەخت کا
لە کەڵیان ڕژدبی، هەڵدێن و دەڕۆن

هۆنراو

(کە تێر بوو پاڵەوان، هەڵمەت ئەباتن
زگ برسیش نەکا، مەشقی هەڵاتن)

١٥- سەرگوزەشتە

یەکێک لە وەزیرە دەرکراوەکان، هاتە ڕیزی کۆڕی دەروێشانەوە، پیت و فەڕی هاودەمی ئەوان کاری تێ کرد. دڵی گەشایەوە و دەروونی ڕووناک بووەوە.

پاشا جارێکی تر خستیەوە سەر کارەکەی و ئاشتی کردەوە، فەرمووی:

با بچێتەوە سەر کارەکەی، بەڵام ئەو نەیویستەوەو گوتی: "تەریکی باشترە لە خەریکی"

چوارینە

کەسێ لە کونجی بێدەنگی دانیشت
دەبەستێ دەمی بەدگۆ و سەگی هار
کاغەز دەدڕێنێ و قەڵەم دەشکێنێ
لە دەست و دەمی بەدگۆ بوو ڕزگار

بە گوێ ڕەشیان[1] گوت: "بە چ هۆیەک بە دواکەوتنی شێرت بۆ خۆت هەڵبژارد؟" گوتی:

"هەتا بەرماوەی نێچیرەکەی بخۆم و لەشەڕی دوژمنانیش لە پەنای هەڵمەتی ویدا بژیم".

گوتیان: "ئێستا کە کەوتوویە ژێر سایە و سێبەری ئەو و پارێزگارییە وی و

١. گوێ ڕەش: دڕندەیەکە بۆ بەرماوە خواردن، هەر بە دوای شێرەوەیە / مامۆستا زەکی.
- گوێ ڕەش: مام ڕێوییەکەی خۆمانە / غەریب پشدەری.

سوپاسی نیعمەتی ئەوت بە دەمدا هات، ئەدی بۆ چی لێی نزیکتر نابییەوە؟ هەتا بتخاتە ناو دەستەودایەرە تایبەتییەکانی خۆیەوە و لە نۆکەرە راست و پاکەکانی خۆییت بژمێرێ..

گوتی: "لەبەرئەوەی لە توندوتیژی و پەلاماری ئەو دڵنیا نیم"

خانە

ئەگەر سەد ساڵ، مەجووسی هەڵبکا ئاگر

ئەسووتێ هەر کە جارێ، تێی کەوێ ئاخر

هێندێک جاران وا رێک ئەکەوێ کە هاودەمانی پاشا، زێڕیان پێ ئەبڕێ و هێندە جارانیش سەریان ئەبڕدرێ. دانایان گوتوویانە: "لە گۆڕانی سروشتی پاشایان، دەبێ زۆر وریابی، کە کاتێک بە سڵاوێک ئەڕەنجێن و گاوێک بە جنێوێک دەستە جلێک ئەبەخشن".

گوتراوە: "زۆر ڕووخۆشی، هونەرە بۆ هاودەم و هاوڕازان و کەموکووڕی و ناپەسندییە بۆ حەکیم و دانایان"

خانە

نرخ و رێزی خـــۆت.. هەردەم بزانە

وازی و گـــاڵتـــە بۆ، هاودەم جــوانە

١٦- سەرگوزەشتە

یەکێک لە برادەرەکانم سکاڵای ناهەمواری رۆژگاری لەلا کردم و گوتی:

"خێزانم زۆرە و خواردنیش کەم، توانای باری هەژاریم نییە، زۆر جاران دێتە سەرم بڕۆم و بگوازمەوە وڵاتێکی تر هەتا بە هەر جۆرێکی بووە بژیەم و کەس ئاگای لە چاکە و خراپەم نەبێ."

خانە

زۆر برسی نووست و کەس پێی نەحەسیا

زۆر مردووش، مرد و کەس بۆی نەگریا

زۆر لە تانە و تەشەری ناحەزان دەترسم، کە پاشەملە پێم پێ بکەنن و هەوڵ و تەقەلاو ماندووبوونەکانم لە حاند خاو خێزانمدا بە بێ مرووەتی و ناپیاوی دانێن و بڵێن:

پارچە

سەیرکە ئەو ناپیاوە، کە هەرگیز

نایەوێ ببینێ، رووی خۆشبەختی

لەش حەسانەوە و سەرسووکی ئەوێ

ژن و ماڵی جێ هێشت، لە ڕۆژی سەختی

لە ژمارە زانیندا هەروەک، دەزانن، شتێک دەزانم، جا ئەگەر بە پشت و پەنای ئێوەوە، کارێکم لای پاشا دەست بکەوتایە، دڵم دادەکەوت و ئاسوودە دەبوو و تا دەشمردم لە سوپاسی ئێوە دەرنەدەچووم، گوتم: "برادەر! خزمەتی پاشایان دوو لایەنی هەیە... ئومێدی نان و مەترسیی گیان و پێچەوانەی بیروڕای ئاقڵمەندانیشە، کە بە ئومێدی نان بکەویە مەترسیی گیان.

پارچە

بۆ ماڵی دەروێش، هیچ کەسێک نایە..

بڵێ بهێنە، باجی زەوی و باغ

بە تاڵی و سوێری، بەشت ڕازی بە

یا جگەرگۆشەت، دانێ لە پێش زاغ

خانە

ڕاستییە جێگای، رەزای خودایە

نەمدی کەس ون بێ، لە ڕاستە ڕایە

دانایان گوتوویانە، چوار کەس لە چوارکەس ئەترسن، باجگر لە سوڵتان، دز لە پاسەوان، تاوانبار لە ئاماژەکار، سۆزانی لە دارۆغە.

ئەوەی لە حیساباندا پاکە، لە لێپێچینەوەی بێ باکە.

پارچە

پەل کێشی مەکە، زیاد لە ئیشت
بە پایە بەرزیت، دوژمن دڵ تەنگە
تۆ پاک بە و باکت لە هیچ کەس نەبێ
کراسی پیسە، کوتەی ژێر سەنگە

گوتم: "بەسەرهاتی ئەو رێوییە، گونجاوی حاڵی تۆیە، کە دیتییان هەروا بە دەم راکردن و هەڵاتنێوە دەکەوت و هەڵدەستایەوە، یەکێک پێی گوت، ئەوە چ قەوماوە، وا هێندە دەترسێی؟ گوتی:

"بیستوومە حوشتران دەگرن بۆ بێگاریێ، پێیان گوت: "هەی بێ مێشک تۆ و حوشتر کوجا مەرحەبا؟ ئێوە چیتان پێک دەچێ؟ گوتی: "وس بە، ئەگەر ناحەز و دوو زمانان لە رق و کینەیەکەوە گوتیان، ئەوەش بێچووە حوشترە و تووش بووم، کێ غەمی رزگاری منیەتی؟ تا تریاک لە بەغداوە دەگاتە جێ، مارانگاز ئەمرێ.

تۆ وەک دەڵێی فەزڵ و ئاینی لە خواترسان و دڵنیاییت هەیە، بەڵام حەسوودان و ناحەز و دوژمنان لە بۆسە و کەناردا خۆیان مات داوە، ئەگەر قسە جوان و پەندە بەنرخەکانی تۆیان بە پێچەوانەوە بۆ پاشا گێڕایەوە، دەتوانی چی بکەی و بەریەرەکانێی پاشات پێ دەکرێ؟

لەبەر ئەوە وای بە باش دەزانم، پاسی سامانی قەناعەتی خۆت بکەیت و واز لە سەرداری بێنی، کە داناییان گوتوویانە:

خانە

دەریا پڕیەتی لە گەوهەر و بێ ئەژمارە
گەر سەلامەتیشت دەوێ، سەلامەتی لە کەنارە

کە هاواڵەکەم ئەم وتەی بیست، داما و ڕووی گرژ بوو و دەستی کرد بە وتەی ڕەنجووری، کە ئەمە چ ئەقڵێکە؟ و چ کارگەیاندنەجێ و تێگەیشتن و هۆشێکە؟ وتەی دانایان، ڕاست و ڕەوان و دروست دەرچوو کە گوتوویانە: "دۆستان لە تەنگاوییەدا بەهانا نەگەن و لە سەر خوانی نانخواردنێ دوژمنان وەک دۆستان خۆ ڕادەنێن و خۆیان دەردەخەن و خۆیانت پێشان دەدەن.

پارچە

بە دۆست دایمەنێ، ئەوەی لە خۆشیت
لێ ئەدا لافی، برایی و خۆش ویستی
دۆست ئەو کەسەیە، ئەگرێ دەستی دۆست
لە تەنگانەدا، کاتی تەنگدەستی

دیتم گۆڕا و بە ئامۆژگارییەکەم دڵتەنگ بوو، چوومە لای خاوەن دیوان، بە ناسیاوییەتێکی کە لەمەوپێشەوە بوومان، بارودۆخ و لێوەشاوەیی ویم تێ گەیاند، توانا و باشییەویم خستە ڕوو، پاش ماوەیەک کارێکی هاکەزاییان دایە و زۆری نەبرد کە پاکی سروشت و جوانی و ڕێکی کارەکانیان پەسند کرد، لەوەش تێپەڕی و پلە و پایەیەکی بەرزتری وەرگرت.

ئەستێرەی بەختی تا دەهات لە بەرزیدا بوو، تا گەییە مەرامەکانی و ئارەزووەکانی هاتنەدی و بوو بە یەکێک لە نزیکەکانی پاشا و پەنجەی ئاماژەی بۆ درێژ دەکراو بووە جێی باوەڕ و متمانە، بە خۆشحاڵی وی زۆر شادمان بووم و گوتم:

خانە

گوێ مەدە ماندوومێتیت و دڵ بەغەم مەبە
کەسەرچاوەی ئاوی ژیان، لە تاریکیدایە

هۆنراو

(دڵی کۆسکەوتە، پڕ نەکەی بە غەم
خوا لوتفی بەدزی، زۆرە نەوەک کەم)

خانە

لە سووڕی گەردوون دۆش دامەمێنە
سەبر تاڵیش بێ، بەری شیرینە

لەو کاتەدا وا ڕێک کەوت من لەگەڵ تاقمە دۆست و برادەرانێکدا چوومە سەردانی مەککە، کە گەڕامەوە، دوو فرسەخم بە پیرەوە هات، هەرکە چاوم پێی کەوت، پەرێشان حاڵ و لەسەر دیمەنی دەروێشانم دیت.

گوتم: "چۆنی؟" گوتی: "هەروەکو گوتت، دەستەو تاقمێک پێم هەڵکالان و ناڕاستییان دەرباره گوتم. پاشا ، خوا هەر پایەداری کا بۆ دەرخستنی ڕاستی و روونکردنەوەی ئەم ناڕاستییەش هیچی نەفەرموو و برادەرانی کۆن و دۆستانی ئەمەکداریش لە وتەی ڕاست و وشەی هەق بێدەنگ بوون و دۆستایەتیی کۆنیان لە بیر بردەوە.

پارچە

نابینی لەلای خاوەن جێ و پایە
مەرایی کاران، دەست لەبان سەرن
کە حاڵی گۆڕا و تێپەڕی ڕۆژی
پێی ئەو خەڵکەیە، ها لە بان سەرن

بەکورتی، گرفتار و دووچاری گەلێک سزایان بووم، تا لەم حەفتەیەدا موژدەی ساغی و سەلامەتییە حاجییان هات، لە بەندی گرانیان دەرباز و رزگار کردم و موڵک و ماڵی میراتییان دامەوە، گوتم: "ئامۆژگاری منت وەرنەگرت کە گوتم خزمەتی پاشایان وەکو سەفەری نێو دەریایە بە ترس و بە کەڵکیشە، یا گەنجت پێ ئەبڕێ، یا شەپۆل گیانت لەبەر ئەبڕێ.

خانە

یا بەهەر دوو دەست، دوڕ لە کۆش ئەکا
یا شەپۆل ڕۆژێ، ئەو بەمردوویی فەرامۆش ئەکا

بە باشم نەزانی لەمە زیاتر، برینی مام دەروێشی بە سەرەنووکی نەشتەری سەرزەنشتان برووشێنم و خوێی پێ داکەم، ئەم کارەم بەم دوو دێرە، کورت کردەوە:

پارچە

دەست و پێت هەردوو، ئەخرێنە ناو کۆت
کە گوێت نەدایە، پەندی پیاوان
ئەگەر خۆ بەری، پێوەدان ناگری
ئەنگوست مەخە ناو، کونە دووپشکان

١٧- سەرگوزەشتە

چەند کەسێکم هاورێ بوون، رەنگ و روویان جوان و دەروونیان ئاراستەو پێ راستە کرابوو، یەکێک لە گەورە پیاوان بیروباوەڕێکی گەورە و باشی بەو دەستەو تاقمە هەبوو، مووچەو بەراتێکی باشی بۆ بڕیبوونەوە، تا یەکێکیان کردەوەیەکی وای لێ دەرکەوت، کە رێکی حاڵی دەروێشان نەبوو، گەورە پیاوەکە باوەڕی پێیان تێکچوو و بازاڕی بێ رەواج کردن.

ویستم بە فێڵێک هەر نەبێ مووچە و بەراتەکەیان رزگارکەم چوومە لای دەرگەوان، رێی نەدامێ و قسەی ناخۆشیشیان پێ گوتم، گوێم نەدایە و لێم نەگرت، چونکە قسەزانان گوتوویانە:

پارچە

لە دەرگای میرو وەزیر و سوڵتان
مەدە.. پێش ئەوەی، یاریدەت بدەن
دەرکەوان و سەگ، غەریبێکیان دیت
ئەم یاخەی ئەگرێ، ئەوەی تر دامەن

کە نزیکەکانی ئەو گەورە پیاوە، بە حاڵی منیان زانی، رێزێکی زۆریان گرتم و جێیەکی بەرزتر و هەورازتریان پێشان دام، دانیشتم، بەڵام من بەملکەچییەوە چووم لە جێگایەکی خوارتر و نزمترەوە دانیشتم.

خانه

لێگەڕێ! کە نۆکەرێکی کەمیشم
با لە ڕیزەی نۆکەراندا، دانیشم

گوتی: ئەڵلا، ئەڵلا! کەی جێ و کاتی ئەم قسەیەیە؟

خانه

گەر لە بان سەروچاوم، دانیشی
نازت هەڵدەگرم، چونکە نازکیشی

بە کورتییەکەی، دانیشتم و دەستم بە قسان کرد و لە هەموو دەرگایەکم دا تا هاتمەوە سەر وتەی هەڵخلیسکانی برادەران و گوتم:

پارچە

چ سووچێکی دیوە، خاوەن بەخششی پێشوو؟
کە بەندەی لە پێش چاوان، وا کەم و خوارە
ئەو خودایە مەزنە، بە گەورەیی خۆی
سووچ و گوناهیش دەبینێ و نانیش هەر بەرقەرارە

فەرمانڕەوا ئەم وتەیەی لەلا پەسند بوو و فەرمووی: "بە دەستووری جاران مووچە و بەراتی برادەران بدرێتەوە، قەرەبووی ئەو ڕۆژانەشیان بۆ بکرێتەوە کە لێیان برابوو" سوپاسی بەخششیم کرد و خاکی بەرپێیم ماچ کرد و داوای لێبووردنی ئەو دەم چەوتییەی خۆمم کرد، دەستبەجێ، هاتمە دەرەوە و گوتم:

پارچە

کە کابە بوو بە ڕووگە، بۆ نیازان
بۆ دیدەنیەی دەچن خەڵکی، چەند فرسەنگ
تۆ دەبێ لەسەر خۆبی، لەگەڵ خەڵکی وەک مە
کە کەس ناهاوێ، بۆ داری بێ بەر سەنگ

١٨- سەرگوزەشتە

شازادەیەک سامانێکی زۆر و فراوانی لە باوکییەوە بەمیرات بۆ بەجێ ما، بانگی سەخاوەتی دا و دەرگای بەخشینی کردەوە و بێ دریغ بەخششی بەسەر گەل و سوپادا باراند:

پارچە

بۆ نخۆشی نایە، لە داری سادە
بەسووتان بۆنێ، ئەدا وەک عەنبەر
گەورەییت بوێ، دەبێ ببەخشی
هەتا تۆو نەکەی، چۆن لێی ئەخۆی بەر

یەکێک لە هاودەمانی بێ ڕاوێژ، دەستی بە ئامۆژگاریکردنێ کرد، کە پاشایانی پێشین ئەم هەموو نیعمەتەیان بە هەوڵ و کۆشش پاشەکەوت کردووە و بۆ تەنگانە و لێقەومان و کەڵک و سوود لێ دیتنێ هەڵگرتووە، دەست لەو بزاوتە بکێشەوە و دەستی لێ بگرەوە، شەڕوشۆڕ و لێقەومان و پێویستی لە پێشە، دوژمنان لە کەمیندان، ناکرێ لە کاتی تەنگانە و پێویستیدا، دەستەوەستان ڕاوەستی.

پارچە

ئەگەر سامانی خۆت بەخشی بە گشت کەس
ئەوەی بەریەکەوێ[1]، دەنکێ برنجە
لە هەرکەس بۆ نەسێنی، دەنکە زێوێ
کە کۆ بۆوە ئەوە، سامان و گەنجە

شازادە لەم وتەیە ڕوو گرژ بوو، لەگەڵ سروشتی ئەودا نەهاتەوە پاشان سەرزەنشتی فەرموو و گوتی: "خوای لەسەر، ئێمەی کردووەتە خاوەنی ئەم وڵاتە، هەتا بیخۆین و بیبەخشین، نەک هەر پاسەوانی بین و چاودێری بکەین."

---

١. بەریەکەوێ: بەری دەکەوێ.

خانە

قاروون بای چل خانووی سامان هەبوو، چوو بە هیلاک
نەوشیرەوان بەوە نەمر بوو، کە بەجێی هێشت ناوی چاک

١٩- سەرگوزەشتە

وا ئەگێڕنەوە کە لە ڕاوگەیەکدا نێچیرێکیان بۆ نەوشیرەوانی دابەروەر دەگردە کەباب، خوێیان پێ نەبوو، نۆکەرێکیان ناردە گوندێک، خوێ بێنێ.

نەوشیرەوان گوتی: "خوێیەکە بکڕە، تاکو نەبێتە شوێن و دێیەکە وێران نەبێ.

پێیان گوت: بەوەندە خوێیە چ دەقەومێ؟

گوتی: بنچینەی ستەم لە سەرەتاوە کەم بووە، هەرکەسێ هاتووە هاویشتوویەتییە سەرێ، تا گەیوەتە ئەم ئەندازەیە."

پارچە

ئەگەر لە باغی میللەتا، پاشا بخوا سێوێکی
نۆکەرانی دەردێنن درەخت، لە ڕەگو ڕیشەوە

کە سوڵتان بەنیو هێلکە، ستەم ببینێ ڕەوا
سەربازەکانی هەزار مریشک دەکەن بەشیشەوە

خانە

زەمان ناهێڵێ، زۆردار بمێنێ
تەنیا نەفرینی، بۆ جێ دەمێنێ

٢٠- سەرگوزەشتە

والییەکم بیست کە هەر ماڵ و خانووی میللەتی کاول و وێران ئەکرد، تا خەزێنەی پاشا ئاوەدان و پڕ کاتەوە، ئاگای لە وتەی دانایان نەبوو کە گوتوویانە: "هەرکەسێ میللەت ئازار بدات، تا دڵی پاشا بەلای خۆیدا ڕاکێشێ، خوای لەسەر، هەر ئەو

گەل و میللەتەی لەسەر زاڵ دەکاتەوە تا دەماری لە ڕۆژگاری ژینی دەرکێشێ و بیبڕێ.

خانە

به (سپەند)[1]ی ناکا، ئاگری داگیرساو
ئەوەی کە ئەیکا، ئاهی جەرگ سووتاو

ئەڵێن شای هەموو دڕندان شێرە و کەمترینی گیانەوەرانیش کەرە، بەڕای هەموو هۆشیار و ئاقڵمەندانیش، کەرێکی بارهەڵگر زۆر باشترە لە شێرێکی پیاودڕ.

دوو تاکی

کەری هەژار، گەرچی بێ تەمیزە
لەبەر باربردنێی، گەلێک عەزیزە
کەر و گایان، کە هەڵ ئەگرن بار
چاترن لە نەوەی، ئادەمی زۆردار

ئەڵێن پاشا لایەنێکی سروشتی خراپی ئەو وەزیرە بەدەی بۆ دەرکەوت، خستیە ژێر ئازار و ئەشکەنجەوە و زۆر بەدەردەسەرییەکی ناهەموارەوە کوشتی.

پارچە

ڕەزامەندی شا، بە دەست ناکەوێ
تا بۆ دڵی گەل، چاکە نەخوازی
ئەتەوێ خودای لەسەر، بتبەخشێ؟
بە چاکە خەڵکی خودا کە ڕازی

وارێک کەوت یەکێک لە ستەمدیتەکان بەلایدا رابرد، سەرنجی دایە حاڵەشرەکەی و گوتی:

---

١. سپەند: دڕکێکی بیابانە، دووکەڵێکی زۆری لە کاتی سووتاندا لێ هەڵدەستێ، بۆ برینی چاو سووتانەوە بەکاری دێنن.

پارچە

نابێ هەرچی تینی قـــۆڵ و بازوویێکی هەبوو
بە سـەڵتەنەت بخوا، ماڵی خەڵکی بە هەوەس
دەتوانی هێسکی گەورە، بە گەروودا قووت بدەی
هەناو و زگ ئەدڕێ، هەرکە گەییە ناوک و بەس

٢١- سەرگوزەشتە

لە مەردم ئازارێک ئەگێڕەوە، کە بەردێکی بەسەری دەروێشێکدا دا، دەروێش دەرفەتی تۆڵەکـردنەوەی نەبوو، بەردەکـەی لای خـۆی هەڵگرت، تـا ڕۆژێکیـان پاشـا لـەو پیـاوە مـەردوم ئازارە تووڕە بوو و خـسـتیـە زیندانەوە، دەروێش هاتە لایەوە و بەردەکـەی بەسەریدا دایەوە، کابرا پێی گوت: تۆ کێیت؟ و ئەو بەردەت بۆ بەسەری مندا دا؟

وەڵامی دایەوە: "من فلانم، ئەم بەردەش هەر هەمان ئەو بەردەیە کە فلانە ڕۆژ تۆ بەسـەری منـدا دا، گـوتی: "ئەدی ئەم هەمـوو ماوە دوورو درێژە لە کـوێ بوویت؟، گـوتی: "لە پلە و پایەکـەت ئەترسـام، ئێـسـتـا کـە لە زیندانێمـدا دیتی، ئەو هەلەم قۆستەوەو بە دەرفەتم زانی، کە دانایان گوتوویانە:

دوو تاکی

ڕەشـوڕووتێکت، کـە دی بەخـتـیـارە
ئەوەی هەسـەتی، جـڵەوی ئیـخـتـیـارە

نینۆکی درێژ و تیـژت، کـە نیـیـە تۆ
کـــەواتە بە کـــژ، بەدانـدا مـــەچۆ

ئەوەی کـە لەگەڵ بازوو ئاسنێ دەست بخاتە کار
قۆڵ و مەچەکی زێوینی ناسکی، خۆی ئەدا ئازار

ڕاوەستە تاکو دەستی ئەبەستێ، دەور و زەمانە
ئەوساکە برۆ مێشکی دەربێنە، ڕۆژی دۆستانە.

٢٢- سەرگوزەشتە

یەکێک لە پادشایان تووشی نەخۆشییەکی کوشندە بوو - واچاکە هەر ناوی نەهێندرێ - دەستەیە لە حەکیم و دانایانی یۆنانی پێکەوە هاتنە سەری و بە بڕیاری هەموویان هاتنە سەر ئەوەی کە ئەم دەردە دەرمانی نییە، مەگەر زراوی کەسێکی کە چەند نیشانەیەک هەن تێیدابێ.

پاشا فەرمووی بیدۆزنەوە و پەیدای کەن، کوڕە جووتیارێکیان بەونیشانانەوەی کە حەکیمان گوتبوویان دۆزییەوە، باوک و دایکی کوڕە بانگ کران و بەخشش و بەراتێکی زۆریان لە پێش دانان و خۆشحاڵیان کردن و قازیش بڕیاری دا کە ڕشتنی خوێنی ئەندام یا تاکێکی میللەت بۆ سەلامەتیی پاشای کارێکی ڕەوا و ڕاست و دروستە، جەللاد بەلایەوە چوو، کوڕە سەری بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە و پێ کەنی پاشا لێی پرسی، لەم کاتەدا چ وەخت و جێی پێکەنینە؟

کوڕە گوتی: نازی کوڕان بەسەر دایک و باوکانەوە هەیە و داواکاریش بۆ لای قازی دەبرێت و داد لە پاشا ئەخوازرێ، ئەوە دایک و باوکم، لەبەر ماڵی دنیایە منیان بە جەللاد سپارد قازیش بڕیاری کوشتنی دام، پاشاش ژیان و بەردەوامی خۆی لە ڕشتنی خوێنی مندا دەبینێتەوە، هیچ پەنایەکی ترم نییە هانای بۆ بەرم تەنیا خوای لەسەران نەبێ"

خانە

بۆ لای کێ بەرم، لە دەست تۆ فەریاد

هەر لە ئاستانەی، تۆ ئەخوازم داد

پاشا بەو قسەیە دڵی تەزی، فرمێسکی لە چاوان داباریین و گوتی: مردنی من چاکترە لە ڕشتنی خوێنی بێ گوناهێکی وا. سەروچاوی ماچ کرد و گرتییە باوەشی و سامانێکی بێ ئەژماریشی پێ بەخشی و ئازادی کرد و دەڵێن پاشاش هەر لەو ڕۆژە بە دواوە چاک بووەوە و شیفای بۆ هات.

پارچە

هەروا لە بیرمە، کە ئەم شیعرەی گوت

فــــیلەوانێکی ڕۆخی دەریای نیل

حـــاڵی مـــێـــرووله، لەژێر پێی تۆدا
وەک حـــاڵی تۆیە، لە ژێر قـــاچی فـــیل

٢٣- سەرگوزەشتە

یەکێک لە بەندییەکانی "عـەمـرو لەیث"[١] هەڵاتبـوو، پیـاوان وە دوای کـەوتن و هێنایانەوە، وەزیرێک قـینێکی زۆری لە بەندەکـە هەبوو، هـانی کـوشـتنی دا، تا بەندییەکانی تریش ئەم جۆرە رەفتارە رەچاو نەکەن، بەندییەکە لەبەر دەمی عەمرو لەیثدا سەری خستە سەر زەوی و گوتی:

خانە

هـەرچیم بـەسـەربێ، بە پەسـەندی تۆ، لەلام رەوایە
لە بـەرامـبـەری ئەم فـەرمـانەتا، نیـمـە داوایە

بەڵام لەبەرئەوەی کـە من پەروەردەی نان و نمـەک و نیـعـمـەتی ئەم خـانـەدانەم، نامەوێ لە رۆژی دواییدا، خوێنی من بتانگرێ، ئەگەر بتەوێ بەندەیەکی بێ گوناهی وەکـو من بکوژی، لە رێیـەکی رەوا و شـەرعـیـیـەوە بیکوژە، تا رۆژی دوایی پێـوەی گرفتار نـەبی، پاشا گوتی: "جا چۆنی بکەم!" گوتی: "رێم بدە هەتا، وەزیر بکوژم، ئەو کاتە لە سزای کوشتنی ئەودا بمکوژەوە، هەقە و شەرعیشە، پاشا پێ کەنی، بە وەزیری گوت: "چی بەباش دەزانی؟ وەزیر وەڵامی دایەوە:

"گـەورەم! ئەم بێ شـەرمـە لە رێی گـۆڕی باوکـتـدا ئازاد کـە، هەتا منیـشی نەخـسـتـووەتە بەڵایەکـەوە، سـووچ لە منەوەیە کـە سـوودم لە ئامـۆژگـاری و وتەی دانایان وەرنەگرتووە کە گوتوویانە:

---

٠١ عـەمـرو لەیث: پاشـای سـەفـارییـەیە لە سـاڵی (٢٦٥)ی کـۆچیـدا بوو بەجـێنشـینی برایەکەی... فارس و کرمان و ئیسفەهان و خۆراسـان و سیستانیشی گرت، لە ساڵی (٢٧٦)ی کۆچیدا، لەشکری خەلیفەی بەغدایەی شکاند. لە (٢٨٧)ی کۆچیدا لەگەڵ ئیسماعیل سامانی لە نزیک (بەڵخ) بەشەڕ هات، بە دیل گیرا، ئیسماعیل ناردییە بەغدا لای خەلیفە. لە (٢٨٩) کۆچیدا لە زینداندا مرد _ یەحیا و عەمر، کورد بوون.
- وەرگێر -

پارچە

لەگەڵ بەرد هاوێژ، بکەی شەڕە بەرد
بزانە کە تۆ سەری خۆت شکان
کە تیرداوێیە سینگی دوژمنت
ئێوەش لە سێرەی، تیرگەلی ئەودان

٢٤- سەرگوزەشتە

پاشای زەوزەن[1] وەزیرێکی هەبوو چاوتێر و ڕووخۆش بوو و لە چاوپێکەوتناندا ڕێزی هەموو کەسێکی دەگرت، پاشەملەش بە چاکەی ناو دێنان، وا ڕێ دەکەوێ کردارێکی لێ ڕوو دەدا، کە پاشا لێی خۆش نایەت، دەیگرێ و دەیخاتە زیندانەوە.

گەورە پیاوانی پاشا، کە چاکەی پێشووی ئەویان لە چاودا بوو و خۆیان بەقەرداری دەزانی، لە کاتی چاودێرییاندا نەرمییان لەگەڵدا دەنواند و سەرزەنش و توندوتیژییان لەگەڵدا بەڕەوا نەدەدیت.

پارچە

لەگەڵ دوژمنی خۆتا ئاشتی کە، ئەگەر ڕۆژێ
پاشەملەش عەیبت بڵێ، تۆ لە ڕوویدا تەحسین کە
وشە لەزارەوە دەردەچێ، کەسی پێ مەدە ئازار
کە تۆ ناخۆشیت ناوێ سا، زمان شیرین کە

لەوەی پاشا لێی دەویست هەندێکی لێ خۆش بوو و لەجیاتی ئەوەی ماشەوە بە زیندان تەواوی کرد و پاک بووەوە، یەکێک لە پاشایانی ئەو ناوە، بەنهێنی نامەیەکی بۆ نارد کە پاشایانی لای ئێوە ڕێزی گەورەی وەک تۆ نازانن، بێ ڕێزییان لەگەڵدا کردی، ئەگەر بڕیاربێ دڵی گەورەی فلانی خۆشەویست - خوا پەنای بدا - بەلای ئێمەدا بێت، تێ دەکۆشاین، ئەوەی شایستەی دڵ ڕاگرتنیەتی دەست بە سینگەوە بین و گەورە پیاوانی ئەم کیشوەرە بۆ دیداری ئەو، بە هیوا و

١. زەوزەن: وڵاتێکە لە نێوان هورات و نیشاپور.

چاوەڕوانی وەڵامن.

وەزیر لەمە هۆشیار بووەوە و بیری لە مەترسی کردەوە، بە گورجی وەڵامێکی کورتی، هەروەکو پێی باش بوو، کە ئەگەر خەبەرەکەشی بکەوێتە سەر دەم و زاران زیانی نەبێ، لە پشت نامەکەوە نووسییەوە و ڕەوانەی کردەوە.

یەکێک لە دەست و پێوەندەکان کە ئاگای لەم سەین و بەینە بوو، بە پاشای ڕاگەیاند کە فڵان، کە فەرمووتە بگیرێ لەگەڵ پاشای لای تردا، نامە و نامەکاری هەیە، پاشا تووڕە بوو و فەرمانی ساغکردنەوەی ڕاستی و درۆی ئەم هەواڵەی فەرموو، نامەبەریان گرت و نامەکەیان خوێندەوە، تێیدا نووسرابوو: "بیروباوەڕی باشی گەوران دەربارەی بەندە، گەلێک لە باشی و چاکیی بەندەی پترە و ناتوانم ئەم داخوازییە بەجێ بگەیەنم، لەبەر ئەوەش کە من پەروەردەی نیعمەتی ئەم خانەدانەم، بە کەمێک گۆڕانی دڵی خاوەن نیعمەتی کۆنم، بێوەفایی ناکەم، وەها گوتراوە:

خانە

ئەوەی چاکەت لەگەڵ ئەکا، لە هەموو بارێک

بیبەخشە کە لە تەمەنیا، هەڵەیەک بکا جارێک

پاشا ئەم ڕەوشتە جوان و باشەی ئەوی بەلاوە پەسند بوو، جلوبەرگ و ماڵێکی زۆری بە پاداش پێ بەخشی، داوای لێبووردنیشی لێ کرد کە بەهەڵە چووبووم، کە تۆم بەبێ تاوان ئازاردا، گوتی:

"گەورەم! بەندە ئەمە، بەهەڵەی گەورەی خۆم نازانم، بەڵکو ئەمە ویستی خوا بوو کە ئازارم پێ بگەیەنن، بەڵام ئازاریش بێ هەر لە دەستی تۆوە بێ چاکترە، کە هەقی نیعمەتی پێشوو و دەستی چاکەت بەسەر ئەم بەندەوە هەیە، کە دانایان گوتوویانە:

دوو تاکی

هەرگیز بە ئازار، لەکەس مەڕەنجە

لای کەس بۆت نایە، خۆشی یا ڕەنجە

دوژمنی و دۆستی هەر لای خواوەیە

دڵی هەر دوو لای، ها وەلاوەیە

ئەگەر چی لە ژێی کەوانرا، دێ تیر
لە هاوێژەری ئەزانن، پیاو ژیر[1]

٢٥- سەرگوزەشتە

لە پاشایەکی عەرەبەوە بیست، کە بەوانەی ناو دیوانێی گوت: کە مووچە و بەراتی فلانی - هەرچەندێکە - بۆی بکەن بە دوو هێندە، چونکە هەمیشە هەر لە دەرگاوە چاوەڕێی بە ئەنجام گەیاندنی فەرمانە و، کەچی نۆکەر و بەردەستەکانی تر هەمیشە هەر خەریکی کاڵتە و گەمە و جەفەنگانن و خاوەخاوەی لە ئیشیدا دەکەن.

خواپەرستێک، گوێی لەمە بوو و هاوار و ناڵەی لە دەروونەوە هەستا، لێیان پرسی ئەوە چیت دیت؟ گوتی: "پایە و پلەی بەندان لەبەر قاپی و دەرگەی خوا، بەم ڕەنگەیە:

هەڵبەست

نۆکەر دوو سبەینان، بێتە خزمەت شا
سێیەم تێی ئەکا، ڕووی لوتف و نیگا
ئومێدمان وایە، پیاوی خوا پەرست
نائومێد نەبن، لە دەرگای ئەلەست

دوو تاکی

گەورەیی لە ملکەچیەتی دایە
یاغیەتی بێبەش بوونی تێدایە
ئەوەی ملکەچی، لە بۆ نووسراوە
سەری خزمەتی، ها لە دەرگاوە

٢٦- سەرگوزەشتە

لە زۆردارێک ئەگێڕنەوە، کە داری سووتانێی بەهەرزان لە هەژاران دەستاند و بەزۆرەملێ لێی دەکرین و هەر بە زۆرەملەش بە گرانتر دەیدایەوە دەوڵەمەندان، پیاوێکی خوایی بەلایدا تێپەڕی و گوتی:

١. پیاو ژیر: پیاوی ژیر.

خانه

ئەوە مـــاری تۆ؟! کێ بیـــینی پێـــوەی دەی
یانە کوندی؟ لە کوێ بنیشییەوە کاولی کەی

پارچە

کـە دەسـتت دەڕوا، بەسـەر ئێـمـەدا
بێ ئاگـا نـیـیـە، خـودای غـەیبـزان
زۆرداری مـــەکـــە، لە خـــەڵکی زەوی
تا ناڵەو فـیـغـان، نەگـاتە ئاسـمـان

زۆردارەکە لەم قسەیە دڵگیر بوو و ڕەنجا و گوێی نەدایە ئامۆژگارییەکانی وی (أخذتهُ العِزةُ بالأثم) - غیـرەتی گـوناه گـرتی - تا شـەوێک ئاگر لە دارەکـانی چێشتخانەکەی بەربوو، هەرچی هەشیبوو سووتا، لە جێی نەرم هێنایە سەر خاکی گەرم. وا ڕێکەوت هەمان کەسەکەی بەلادا ڕابرد و گوێی لێ بوو کە بە دۆستەکانی خـۆی دەگـوت: "نازانم ئەم ئاگـرە لە کـوێوە بەربووە مـاڵی مـن؟ گـوتیـان: "لە چرە دووکەڵی دڵی هەژارانەوە"

پارچە

دووربــە لـە ئـاهــی، دڵ بـریـنـداران
هەناسـەی گـەرمی.. خـراپە، ئاخـر
تا ئەکرێ دڵی کەس، مـەکە غەمـبار
ئاهێک.. جـیـهـانێک ئەخـاتە ئاگـر

لەبەر هەیوانی تەلاری کەیخوسرەو[1] ئەم حیکمەتە نووسرابوو:

---

١. کەیخوسرەو: یەکێکە لە شایەکانی دەوڵەتی دووەمی کەیانی.

پارچە

ســـاڵهـای ســـاڵە و عــومــرێکی درێژ
بەســـر ئێـمــەدا، خــەڵک ئەکــەن گــوزەر
دەستاو دەست موڵکمان کە هاتۆتە دەست
واش دەچێـتـە دەست خــەڵک، ســەر لەبەر

٢٧- سەرگوزەشتە

یەکێک لە هونەری زۆرانبازییەدا، گەیبووە ئەوپەڕی پایە بەرزی. سێسەد و شەست فێڵی لە زانیاریی زۆرانبازییەدا دەزانی و هەر جارە بە جۆرە هونەرێکی تازەوە زۆرەبانی دەگرت تا دڵی لە شاگردێکیانی داخورپا، سێسەد و پەنجا و نۆ فێڵی لە هونەری زۆرانبازییەدا فێر کرد و تەنیا فێڵێکی بۆ خۆی هێشتەوە و بەلاوەی نا.

بە کورتییەکەی، کوڕەکە، لە هێز و توانا و هونەری زۆرانبازییەدا پڕبوو و کەس نەیدەتوانی بەرامبەری ڕاوەستێ و پشتی لە عەردی بدا، هەتا ڕۆژێکیان لەلای پاشای ئەو کاتدا دەری بڕی و گوتی:

"ئەوەی مــامــۆســتــایەکــەم بەســەر منیــەوە هەیە، چاکــەی فــێــرکــردن و پەروەردەکەمیەتی، دەنا بەهێز و توانا لەو کەمترنیم و لە هونەریشدا وەکو ئەوم.

پاشا ئەم وتانەی زۆر بەلاوە گران و ناخۆش هات، فەرمووی:

"زۆرەبانی بگرن! جێگایەکی پانوپۆڕ و بەرین و هەراویان ڕێکخست، وەزیر و پیاوماقووڵ و گەورە پیاوانی دەربار و پیاوە مەزنەکانی هەرێمەکان، هەموو هاتن.

کوڕە لاو لە مەیدانێدا وای پڕدایە مامۆستایەکەی، کە ئەگەر کێوی ئاسن بووایە، لە جێیدا هەڵدەقەند.

مامۆستا هەستی کرد، کە کوڕە لاو لەو بەتین و باخۆشترە و لە هونەرەکەشیدا، لە گەڵیا بەرامبەرە، بەو فێڵە سەیرەی کە لێی پەنا دابوو ڕەفتاری لەگەڵ کرد، کوڕە نەیتوانی ئەم فێڵە لە خۆی لادا.

مامۆستا، کوڕەی بە هەردوو دەستان لە زەوی بەرزکردەوە و لەسەر سەری خۆی سووڕاندو لە عەردی کوتا، قریوە لە تەماشاچییان بەرز بووەوە.

پاشا فەرمانی دا خەڵات و بەخشش و بەراتێکی باش بە مامۆستا ببەخشرێ و کوڕەکەشی سەرزەنشت کرد و ڕەخنەی ئەوەی لێ گرت کە لەگەڵ مامۆستا و ڕاهێنەر و مەشقدەرەکەیدا، پەنجەی لێک داوە و سەریش نەکەوت. کوڕە گوتی: "گەورەم مامۆستا بەهێز بەسەر مندا سەرنەکەوت، بەڵکە من لە هونەری زۆرانبازیدا، فێڵێکی بچکۆلانەم مابوو، درێغی فێرکردنێی لێ کردم و فێری نەکردم، ئەوڕۆ بەو فێڵە بچکۆلانەیە، دەستی لە من ساند و سەرکەوت، مامۆستاکە گوتی:

"ئەو فێڵەم بۆ ڕۆژێکی وا هەڵگرتبوو، کە دانایان گوتوویانە... هێندە ڕێ بە دۆست مەدە کە هەموو هێز و توانایەکی تۆ بزانێ، کە دوژمنایەتیی کردی پێت بوێرێ و بتخا.

نەتبیستووە ئەوەی کە لە شاگردی خۆی ئازار دیوە، چی گوتووە؟:

خانە

(فێرە تیر هاویشتنێی دەکەم، هەموو ڕۆژێ
کە دەستی تیری گرت، هاویشتیەوە من)

پارچە

یا وەفا نەبووە، لەم جیهانەدا
یا هەر کەس نییە، لەم زەمانەدا
کەس نەبوو فێری، تیر ئەندازی لێم
کە من نەکاتە، دوایین نیشانە

٢٨- سەرگوزەشتە

دەروێشێک بە تەنیا لە گۆشەی چۆڵێکدا دانیشتبوو، پاشایەک بەلایدا تێپەڕی، دەروێش کە لە کونجی قەناعەتدا لەو چۆڵەوانییەدا ئەژیا، سەری بڵند نەکرد و گوێی نەدایە فەرمانڕەوا - پاشا - هەستی فەرمانڕەوایی و گەورەیی پاشایەتی گرتی، گرژ بوو و گوتی: "ئەم دەستە کۆنە پۆشانە، هەر دەڵێی چوار پێن، نرخ و پیاوەتییان نییە"

وەزیر بەلایەوە چوو و گوتی: "هۆی دەروێش فەرمانڕەوای سەر زەوی بەلای تۆدا تێپەڕی، بۆ هەڵنەستای و دەستت بەسنگەوە نەگرت و ئەرکی رەوشت نواندنێت بەجێ نەگەیاند؟"

وەلامی دایەوە: "بە فەرمانڕەوا بڵێ! چاوەڕێی ڕێزلێنان لە کەسێک بکا چاوەڕێی چاکە و ماڵی ئەوە، فەرمانڕەوایان پاسەوانی گەلن، نەک گەل بۆ بەندایەتی و فەرمان هەڵگرتنی فەرمانڕەوایانن.

پارچە

پاشا پاسەوانی هەژارانە
چەند لە خۆشی و گەورەیی دابێ
پەز بۆ شوان دروست نەکراوە
شوان بۆ پەزەو دەبێ شوانی چابێ

پارچە

رۆژێ کەسێکت، دیت کامەرانە
یەکێ تر دڵگیر، زۆر پەرێشانە

کەمێک بووەستە، تا هەردووکیان خاک
مێشکیان دەخوا، کە جێی بیریانە

جیاوازی دارا و نەدار نامێنێ
لەم بڕیارەی کە چارەنووسیانە

گەریەکێک گۆڕێک، هەڵبداتەوە
نازانێ دارا و نەدار کامیانە

فەرمانڕەوا قسەکەی دەروێشی پێ خۆش بوو، پێی گوت: "چیت دەوێ بڵێ" وەلامی دایەوە: "من ئەوەم دەوێ جارێکی تر نەمڕەنجێنی". گوتی: "ئامۆژگارییەکم بکە"، گوتی:

خانه

وریابە کە ئەو خۆشییەت لە دەستە
دەڕوا ئەو موڵکەی، ئێستا لە دەستتە

٢٩- سەرگوزەشتە

یەک لە وەزیران چووە لای "زوننونی میسری" و هیمەتی لێ خواست کە ڕۆژ و شەو خەریکی خزمەتی فەرمانڕەوام، هیواداری چاکەیم و لە سزاشی ئەترسێم. "زوننون" گریا و گوتی: ئەگەر منیش ئەوەندە لە خوا ترسابامایە وەک تۆ لە فەرمانڕەوا دەترسی، ئەوە لە کۆمەڵەی یاران ئەبووم.

پارچە

گەر هیوای پشوو و ڕەنج ئاسان بایە
پایی دەروێشان، لە ئاسمان ئەبوو

گەر وەزیر لە خوا، ترسابا، وەکو
لە شا ئەترسێت، وەک پەریان ئەبوو

٣٠- سەرگوزەشتە

پاشایەک فەرمانی کوشتنی بێ گوناهێکی دا، گوتی ئەی پاشا بەو قینەی کە لەمنتە، ئازاری خۆت مەدە، چونکە ئەم سزایە بەیەک هەناسە بەسەرمندا تێدەپەڕێت، بەڵام گوناهی ئەمە بۆ هەتاهەتایە داوێنت دەگرێ و لێت نابێتەوە.

چوارینە

سووڕی دەورانێ، وەک بای بیابان چوو
ناشیرن و جوانی، تاڵ و خۆشیان چوو
زۆردار بیری چوو، ئەو غەدرەی کردی
لەو نابێتەوە لە مەوەمانان چوو

شا ئامۆژگارییەکەی ئەوی بەسوودمەند زانی و لە خوێن رشتنێی چاوپۆشی کرد.

٣١- سەرگوزەشتە

وەزیرانی نەوشیرەوان کە تاوتوێی گرینگیی وڵاتیان دەکرد و هەریەکە بەپێی زانینی خۆی بیروڕای خۆی دەردەبڕی، "شا" ش هەروەتر، ئەویش بیروڕای خۆی لە بەرابەر ئەو کارەوە دەربڕی.

"بوزەر جومهەر" لایەنگیری بیر و بۆچوونی "شا"ی کرد، وەزیرەکانی تر بە دزییەوە لێیان پرسی، چ شتێکی باشترت لە بیروڕای "پاشا" دا دیت، کەوا لە بیروڕای چەندان زانا و دانایانی ترت بە چاکتر زانی وا لایەنگیریت کرد، گوتی: بە پێی ئەوەی ئەنجامی کارەکە دیار نییە و نازاندرێت و هەمووشتان هەر لەسەر ئەو رایەن کە داخوا کارەکە راستە یا هەڵەیە، بۆیە بیروڕا وەرگرتنی شا چاکترە.. هەتا ئەگەر ئیشەکەش بە پێچەوانەی راستییەوە بێتە پێش، بە هۆی لایەنگیری و پەسنی بیروڕای شاوە، لە مەترسی گلەیی و گازەندان رزگار ئەبین، کە گوتوویانە:

دوو تاکی

بە دژی بیری شا، بیرێ دەربڕی
دەست لە خوێنی خۆت، ئەبێ هەڵگری
ئەگەر شا بە ڕۆژ بڵێ، وا شەوە
بڵێ راست دەکەی مانگ، چاردە شەوە

٣٢- سەرگوزەشتە

گەڕیدەیەک، قژی ئەهۆندەوە و ئەیگوت: "من لە نەوەی "عەلی" مە. لەگەڵ کاروانێکی حیجازی، لە شارێک دابەزی گوتی کە لە حەج دێمەوە، چامە (قەسیدە) یەکی بردە دەرباری فەرمانڕەوا و وای پێشان دا کە ئەو بۆ خۆی دایناوە، یەکێک لە هاودەمەکانی فەرمانڕەوا لەو ساڵەدا لە سەفەری دەریا هاتبووەوە گوتی: "من ئەوم لە جەژنەی قوربانداا، لە بەسرەدا دیوە، چۆنی حەج کردووە؟"

یەکێکی تر گوتی: "من ئەمە ئەناسم، باوکی تەرسایی بوو، لە "مەلاتییە"، ئەوە چۆن نەوەی "عەلی" یە؟ و چامەکەشی کە دەڵێ خۆی دایناوە، لە دیوانی "ئەنوەری" دا نووسراوەتەوە.

فەرمانڕەوا فەرمانی لێدان و دوورخستنەوەی دا، گوتی:

"ئەم هەموو درۆیەی بۆ چی کرد؟" گوتی: "ئەی خاوەنی رووی زەمین! قسەیەکم ماوە لە خزمەتتدا بیڵێم، ئەگەر ڕاست نەبوو هەر سزایەکم بفەرمووی پێم رەوایە" گوتی: "چییە؟" گوتی:

پارچە

گەر بێگانەیەک ماستی بۆ هێنای
دوو پەرداغی پڕ.. ئاوەو کەچکێ دۆ
لە من مەڕەنجێ، کە درۆم لا کردی
جیهانگەڕ وایە، حەز ئەکا لە درۆ

٣٣- سەرگوزەشتە

وەزیرێک بەزەیی بە ژێردەستاندا دەهاتەوە و هەمیشە بۆ چاکەیان تێ دەکۆشا، وا ڕێک کەوت وەزیر بەفەرمانی فەرمانڕەوا گیرا، هەموو لە هەموو بۆ بەردان و رزگارکردنی کەوتنە خۆ، ئەوانەی کە بۆ ئازار و ئەشکەنجەدانێ داندرابوون، نەرمییان لەگەڵدا نواند، گەورە پیاوانیش ستایشی کردار و پیاوەتییە باشەکانیان کرد تا فەرمانڕەوا چاوی لە هەڵەکانی پۆشی، پیاوچاکێک لەم کارە ئاگادار بووەوە و گوتی:

پارچە

تا دڵی دۆستان بەدەست بهێنی
باغەکەی باوکت، بفرۆشی باشە

بۆ نانی، دۆستە باشەکانی خۆت
هەموو ناوماڵت، بسووتێ باشە

لەگــەڵ بەدکــاران، هەم بکە چاکــە
بەنانێ زاری ســەگ، بدرووی باشـــە

٣٤- سەرگوزەشتە

یەکێک لە کوڕەکانی "هاروونە ڕەشـید" بە توورەییـیەوە هاتە لای باوکی و گوتی: "فـلآنە سـەرهەنگزادە، جنێـوی بە دایکم دا... هاروونە ڕەشـید بە گەورە پیـاوانی دەوڵەتی گوت، سزای ئەم جۆرە کەسـە چ بێ باشـە، یەکێک ئاماژەی بە کوشتن و ئەوی تر بە زمـان بڕین و یەکێ تر بە دەست بەسـەرداگـرتنی مـاڵ و سـامـان و شاربەدەرکردنی کرد.

هاروون گوتی: "کوڕا من! گەورەیی لە بووردنداية و ئەگەر ناشتوانی بیبووری، ئەوا تۆش جنێـوەکـەی پێ بدەوە، بەڵام لە سنووری تۆڵەکـردنەوە تێنەپەڕی دەنا ستەم لەلایەن تۆوە ئەبێ و داوا و هەق لای دوژمنتەوە.

بەپیـاو ناژمێـردرێ، لەلای هۆشـیـاران
لە فـیلێکی مـەست، مـەیدان بخـوازێ
پیاو ئـەو کەسـەیە، گەر راسـتت ئەوێ
لە توورەبوونا، قـــســـــەی نەترازێ

دوو تاکی

یەکـێک بەدخـووێک، جنێـوی پێ دا
خۆی ڕاگـرت، گوتی وەرە هـەی کلـۆڵ
لەوەشم زیاتر پێ بکەی، ســبـــەی..
عەیبم نیو هێندەی، خۆم نازانی، زۆڵ

٣٥- سەرگوزەشتە

لەگەڵ کۆمەڵێک گەورە پیاو، لە کەشتییەکدا دانیشـتبووم، لە دوامـانەوە کەشتییەکی بچووک نقووم بوو. دوو برا کەوتنە ناو گێژاوێکەوە، گەورە پیاوێکیـان بە مەلەوانێکی گوت: "ئەو دووبرایە دەربێنەوە بۆ هەر یەکێکیان پەنجا دینارت ئەدەمێ".

مەلەوان یەکێکیانی رزگار کرد و ئەوی تریان گیانی بەخوای خۆی سپاردەوە، گوتم: "ئەمەنی هەر هێندە مابوو بۆیە کەمتەرخەمی و سستیت لە ڕزگارکردنی کرد". مەلەوانەکە پێ کەنی و گوتی:

"ئەمەی تۆ گوتت راستە، بەڵام من حەزم لە رزگارکردنی ئەمەیان زیاتر بوو، لەبەرئەوەی کاتێک لە ڕێگایە ماندوو بوویووم، ئەمەیان سواری حوشترەکەی خۆی کردم و لە دەست ئەوەشیان قامچیم خواردبوو".

گوتم: "خوای گەورە ڕاستی فەرمووە (من عمل صالحا فلنفسه ومن أساء فعليها) واتە.. ئەوەی چاکە بکا بۆ خۆیەتی و ئەوەی خراپەش بکا لەسەر خۆیەتی"

پارچە

هەتا ئەتوانی، کەس مەدە ئازار

چونکە ئەو ڕێیەت پڕ لە خار ئەبێ

کاری هەژار و دەروێش پێک بێنە

تۆش ڕۆژێ دادێ، زۆرت کار ئەبێ

٣٦- سەرگوزەشتە

دوو برا هەبوون، یەکێکیان خزمەتی فەرمانڕەوای ئەکردو ئەوەی تریشیان نانی قۆڵ و بازوو و مەچەکی خۆی ئەخوارد.

جارێکیان برا دەوڵەمەندەکەیان بە برا هەژارەکەی گوت:

"بۆ نایەی خزمەت بکەی تا لە ماندووەتی و شەکەتی کارکردنێت رزگار ببێ؟"

گوتی: "ئەی تۆ بۆ کار ناکەی تا لە خزمەتکاری و سووکی و پەستییەتیت ڕزگار ببێ؟ کە دانا و ئاقڵمەندان گوتوویانە:

"نانی جۆ خواردن و لەسەر عەردی ڕووت دانیشتن چاترە لە کەمەرەی زێڕ بەستن و لە خزمەت ڕاوەستان".

خانە

بە دەستی ئاسنین، قسڵ بکەیتە هەویر

نەک بەسینگیەوە بگری، لە پێش ئەمیر

پارچە

عومری عەزیزت لە دوو شتان بەسەربرد
هاوین چ بخۆم و چ لەبەرکەم زستان
ئەی زگی برسی، بە نانێ ساز بە
تا بۆ هیچ کەسێ، دانەنوێنی شان

٣٧- سەرگوزەشتە

یەکێک موژدەی بۆ نەوشیرەوانی دادپەروەر هێنا کە: "خوای گەورە و بەهێز و توانا، فلانە دوژمنتی لە ناوا هەڵگرت و مرد".

نەوشیرەوان گوتی: "هیچت لەوەی بیستووە کە وازی لەمن هێنابێ".

خانە

بۆ مەرگی دوژمن، نابێ شادمان
کە ژیانی ئێمەش، نابێت جاویدان

٣٨- سەرگوزەشتە

کۆمەڵێک لە دانایان لە بارەگای "کیسرا" لە کارێک ئەدوان، بوزەر جومهەر بێ دەنگ بوو، گوتیان: "ئەوە بۆ لەم بارەیەوە لەگەڵ ئێمەدا نادوێی و هاوبەشی قسان ناکەی؟"

گوتی: "وەزیران وەکو پزیشکان وان، پزیشکیش دەرمان بە نەخۆش نەبێ نادا، دوای ئەوەی کە دیم ڕای ئێوە ڕاست و دروستە، زانیم قسەکردنم لەم بارەوە دانایەتیی تێدا نابێ".

پارچە

کە ئیشێک پێک هات، بێ دەست لێدانم
قسەکردنی تێدا، بە جوان نازانم
کوێر و چاڵێکم، کە دیت لە پێشم
گوناهە ئەگەر، بێ دەنگ دانیشم

٣٩- سەرگوزەشتە

"هاروونە ڕەشید" کە کیشوەری میسری کەوتە دەست، گوتی: "بە پێچەوانەی ئەو زۆرداره ئەکەم کە بەکیشوەری میسر لە خۆی بایی بوو و داوای خوایەتیی کرد، من ئەم کیشوەرە بە هەرزانترین نرخ دەدەمەوە بەندەکانی خۆم و لەوان بەولاوە نایدەمە کەسی تر، قوله زەنگییەکی هەبوو، ناوی "خوسەیب" بوو، کیشوەری میسری بە هەرزانی پێ بەخشی.

وا دەگێڕنەوە کە زۆر گەمژە و کەودەن و بیر تەسک بوو، ساڵێکیان دەستەیەک جووتیاری میسری هاتنە لا و سکاڵایان کرد کە پەمۆمان لە کەناری "رووباری نیل" داچاندبوو و بارانی ناوەخت هات و هەمووی نابووت کرد، خوسەیب گوتی: "دەبوایە خوری بچێنن تا نابووت نەبێ، دانایەک ئەمەی بیست و پێ کەنی و گوتی:

دوو تاکی

ئەگەر خۆراک، بەپێی زانین درابا
لە دەستتەنگی دەبا، نادان نەمابا

خودا خۆراک ئەداتە پیاوی نادان
کە واقیان وڕئەمێنێ، هەرچی زانان

دوو تاکی

بەخت و خۆشی کوا بە زانینی کارە
هەمووی لە سایەی خوای کردگارە

لە دنیا زۆرن و لەبەر چاوانن
گێلە پیاو دارا و دانا بێ نانن

کیمیاگەر دەمرێ، بە دەم ڕەنجەوە
شێت شاگەشکەیە، بەدەست گەنجەوە[1]

---

١. گەنج: سامان و دارایی.

٤٠- سەرگوزەشتە

کەنیزەیەکی "خوتەن" یان بۆ فەرمانڕەوایەکی هێنا، کە لەوپەڕی جوانی و ئێسک سووکیدا بوو، ویستی بەمەستی بچێتە لای، کەنیزەکە نەیهێشت و خۆی بە دەستیەوە نەدا، فەرمانڕەوا تووڕە بوو، دای بە قولەڕەشێکی کە لێوی سەرەوەی لە پەڕەی لووتی تێپەڕیبوو و لێوی ژێرەوەشی بەسەر زگیدا شۆڕ بووبووەوە، لە دیمەنی زلییەی "سەخرەی جننی" بیدیبایە ڕای دەکرد، قەترانی لەبن هەنگڵیەوە هەڵدەقوڵی. خانە

ئەڵێی تا قیامەت، ناشیرنی ڕووانی[1]
لەودا کۆتایە و لە یوسف جوانی

هەروەکو گوتراوە:

پارچە

کەس نییە وەک ئەو، ناشیرین دیمەن
ناشیرینییەکەی، پەرت و بڵاوە
بۆنی بن هەنگڵی، پەنامان بەخوا
کەلاکە و لەبەر، سووری هەتاوە

قولە ڕەش لەو کاتەدا هەوەسی هەستا، ئارەزووی بەسەردا زاڵ بوو و ئیشی خۆی لەگەڵ کرد.

بەیانی کە فەرمانڕەوا هۆشیار بووەوە، داوای کەنیزەکەکەی کرد، بەڵام دەستی نەکەوت، قین گرتی، فەرمووی قولە و کەنیزەکەکە دەست و پێ ببەستن و پێکەوەیان لەسەربانی کۆشکێوە هەڵدەنە کەندێکیەوە. یەکێک لە وەزیرە باشەکان ڕووی تکای لە زەوی خشاند و گوتی: "قولەی بێ دەرەتان لەمەدا سووچ و گوناهی چییە، ئەویش وەکو هەموو بەندە و خزمەتکارەکان چاوەڕێی بەخشش و مووچەو بەراتە لە فەرمانڕەوا. فەرمانڕەوا گوتی: "ئەگەر لەم کارەدا شەوێک ڕاوەستابایە، چ ئەبوو؟" گوتی:

"ئەی خاوەنی ڕووی زەوی، نەتبیستووە کە گوتراوە":

---

[1] . ڕووانی: دەموچاو و ڕووی.

پارچە

تینووی سووتاو کە ئەگاتە سەرچاوەی ئاوی حەیات
پێت وانەبێ کــــە لە فــیلی تینوو بتـــرسێ

برسی ببـــینێ، مـــاڵێکی پڕ لە خــــۆراک
باوەڕمــەکــە، لە ڕۆژوو و لە ڕەمـــەزان بپــرسێ.

فەرمـانڕەوا ئەم وتە خۆشـەی لێ خۆش هات و گوتـی: "ئەوە قولەم بەتۆ بەخشی، ئەی چی لە کەنیـزەکەکە بکەم؟ وەزیر گوتـی: "کەنیـزەکەکەش بەقولە ڕەشـەکە ببەخشە، کە نیوە خواردەی سەگ هەر ڕەوای سەگە، کە گوتراوە:

پارچە

هەرگیز تۆ ئەوە مەکە دۆستـی خۆت
لە چوونە جێیەک، تۆ نایکەی پەسەن

تینوو حـەز ناکـا، لە ئاوێ شـیـرین
کــە بەرمـــاوەبێ، لەبەر دەم بۆگـــەن

پارچە

ئیدی دەسـتـی شـا، لە کوێ ئەیبینێ
تورنجی کـەوتووی لەناو ســەرگــەنی

تینوو قــەت دڵی ناچێتــە ئەو گـۆزەی
لای دەم بۆگـــەنێک، بۆ ئەوی بێنی

٤١- سەرگوزەشتە

لە ئەسکەندەریان پرسی، کـیـشـوەری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوات چۆن گـرت؟ خـۆ فەرمانڕەوایانی پێشین، گەنج و دەسەڵات و لەشکریان لە تۆ پتر بوو، کەچی ئەو چەشنە پیرۆزی و سەرکەوتنانەیان بۆ پێک نەهات.

گوتی: "بە پشتیوانیی خوای، هەر کیشوەرێکی کە گرتم، ئازاری خەڵکەکەیم نەدا و نەمرەنجاندن و ناوی پاشا پێشینییەکانیشم بە باشی نەبێ، نەهێنا".

خانە

بەگەورەی دانانێن، گەورە پیاوان
ئەوەی بەسووکی بێنێ، ناوی گەورە پیاوان

پارچە

ئەمانە هیچن، کە لێت تێپەڕین..
تەخت و بەخت و ئەمر و ناو و گیرودار
ناوی چاکان قەت مەفەوتێنە، هەتا
ناوی چاکەی تۆش بمێنێ، بەرقەرار

## دەرگەی دووەم

# لەبارەی خووی دەروێشانەوە

١- سەرگوزەشتە

یەکێک لە گەورە پیاوان بەخواپەرستێکی گوت: "لەبارەی فلآنە خواپەرستەوە دەڵێی چی، کە کەسانی تر بە تانە و تەشەر و گازەندەوە نەبێ ناوێ ناهێنن؟" گوتی: "لەوەی دیارە عەیب نابینم و ئەوەی دیاریش نییە، ئەوە غەیبزان نیم"

پارچە

هەر کەسێکت دیت، لەبەریدا بوو کراسی پاکان
لێی ورد بەرەوە و داینێ بەزاهید لە دەستەی چاکان
ئەگەر نەتزانی چی لە دەروونیا، خۆی حەشارداوە
چیت بەسەریەوە، وەلی کە و برۆ لەگەڵ بێباکان

٢- سەرگوزەشتە

دەروێشێکم دیت سەری لە ئاستانەی کابە هەڵدەسوی و دەیگوت: "ئەی لێبووردەی بەبەزەیی! تۆ دەزانی نادان و ستەمکار چییان لێ دەوەشێتەوە؟"

پارچە

لە کەمتەرخەمیم پۆزشم بۆ لای تۆوە هێناوە
کە توانام نییە ڕووی بەندایەتی خۆمت بۆ دەرخەم
ئەوەی یاغییە بۆ تۆبەی گوناه، ڕوو لە تۆ ئەکەن
کەچی عاریفان لە عیبادەتا داوای لێ خۆشبوون ئەکەن زۆر و کەم

خواپەرستان خواپەرستی ئەخوازن و بازرگانانیش نرخی کوتاڵ و کەلوپەل، منی بەندە بۆ تکا هاتووم بەبێ پەرستن و بۆ دەرۆزە هاتووم نەک بۆ بازرگانیکردن.

(أصنع بي ما أنت أهله ولاتفعل بنا مانحن بأهله)

واتە: ئەوەم لەگەڵ بکە کە شایستە و شایانی تۆیە و ئەوەمان لەگەڵ مەکە، کە شایستە و شایانمانە.

خانە

گەر بمبەخشێ یالێم بگرێ، سەر و رووم هەر لە دەرگایە

بەندە فەرمانێکی نییە، هەر لە ژێر فەرمانتدایە

پارچە

لە دەرگای کابە، سواڵکەرێکم دی

دەگریا و دەیگوت، بە دەنگێکی خۆش

نالێم تاعەتم، لێ قەبووڵ بکە

گوناهەکانم، رەش کەرەوە تۆش

٢- سەرگوزەشتە

(عەبدولقادری کەیلانی)[1] یان دیت - خوای لێ رازی بێ - کە لەناو ماڵی کابەدا، رووی خۆی نابووە سەر بەردە وردەکان و ئەناورایەوە و ئەیگوت:

"خوایە! بمبەخشە! ئەگەر ئازاریشم پێ رەوا دەبینی لە رۆژی قیامەتیدا بە کوێریم زیندوو بکەوە، تا لە رووی پیاوچاکاندا شەرمەزار نەبم."

١. عەبدولقادری کەیلانی: یەکێکە لە پیاوانی تەریقەت، ساڵی (٥٦٨) کۆچی، کۆچی دوایی کردووە. ئارامگایەکەی لە بەغدایە.

پارچە

ڕوو لەسەر خاکی کەساسی، ئەڵێم
بەیانان کاتێ یادی تۆم بۆ دێ
ئەی ئەوەی هەرگیز، ناتکەم فەرامۆش
تۆش جارێک، ئەکەی لە بەندە یادێ؟

٤- سەرگوزەشتە

دزێک چووە ماڵی خواپەرستێک، چەندی گەڕا هیچی نەدۆزییەوە، بە دڵتەنگی گەڕایەوە، خواپەرستەکە بێدار بووەوە، کلیمەکەی کە لەسەری نووستبوو و هێنای فڕێدایە سەر ڕێگای دزەکە، تا بە نائومێدی و بە دەستی بەتاڵ نەڕواتەوە.

بیستم پیاوانی ڕێگای خودایی
دڵی دوژمنیش، هەرگیز ناکەن تەنگ
کەی ڕێک دەکەوێ، بەو پایە بگەی؟
کە وەل[1] دۆستانیش، هەتە سەری جەنگ

خۆشەویستی دڵپاکان چ لە ڕوو و چ پاشەملە، نەک وەکو ئەوانەی پاشەملە عەیبەت لێ ئەگرن و لە بەرەوڕووشدا بۆت ئەمرن.

خانە

لە ڕوودا دەڵێی، مەڕی هێمنە
لە دواوەش، گورگی هاری پیاودڕ

خانە

هەرکەسێ عەیبی، کەسێکی هێنا
بێگومان هی تۆش، ئەباتە ئەولا

---

١. وەل: لەگەڵ

٥- سەرگوزەشتە

چەند کەسێکی گەڕیدە، کە بۆ گەڕانێک ڕێک کەوتبوون، کە هاوبەشی خۆشی و ناخۆشی و ڕەنج و ئاسوودەیی یەکتر بن، ویستم ببمە ئاوەڵیان بەڵام پێکیان نەکردم و گوتم: "ئەمە لە بەخشش و خووی دەروێشان دوورە کە ڕوو لە ئاوەڵییە بێ نەوایان وەگێڕن و لە خۆشی و کەڵک و سوود وەرگرتنێ بێبەشی کەن.

خۆ من ئەمەندە لە خۆم ڕادەبینم کە لە خزمەتکردنی، دۆست و ئاواڵاندا چالاک بم، نەبمە باری گران بەسەر دڵانەوە

خانە

(ئەگـــــەر لە وڵاغی ســــــوار نـەبم

هـەڵـگری ســـــــەرجل و بـاری ئـەبم)

یەکێک لەوان گوتی: "لەوەی کە بیستت دڵگیرمەبە، لەم چەند ڕۆژانەدا دزێک لە شێوەی دەروێشـان هاتە لامـان و خـۆی زۆر بەئاشنا پیشـان دا، لەبەرئەوەی دەروێشـانیش سەلامەتی حاڵیان هەیە، هیچ گومانێکی خراپیان پێ نەبرد و بە ئاواڵەتی و هاوڕێی خۆیانیان قبوڵ کرد.

خانە

خـەڵکی چووزانن، کـراس کـێی تیـایە

نووســـەر ئەزانێ، نامــە چی تیــایە

دوو تاکی

دیمـەنی حــــاڵی زاهیــــدان دەلقـــە[1]

ئەمــەندە بەسـە، کـە فـێڵ لە خــەڵقـە

تۆ تـێ بکۆشـە، چیت ویست لەبەرکـە

ئالایەک هـەڵدەو تـاجێ لەســــەرکــە

---

١. دەلقە: کراسێکی پیناویی ڕەنگاوڕەنگە، دەروێش لەبەری دەکەن.

ئـــارەزوو و هـــەوەس، بـــنـــێ بـــەلاوە
نەوەک بەتـەرکی، کـــراس و کـــەواوە

پیـاو با قـەلغـانی، ئارمـووش بپـۆشێ
چەکی دەست ناپیـاو، لە شـەڕ بە پووشێ

ڕۆژێک تا ئێوارێ ڕۆیشـتبووین، شـەوێ لەبن دیواری قەلاتێکیدا نووسـتین، دزی نامەرد مـەسینەی ئاواڵێکی هەڵگرت و گوایە ئەچێتە سەراو، کەچی بە خۆ و بە تالانییەوە لێی دا و ڕۆیی.

خانە

خـوابەرست خـەرقـەی[1] کـردەبەر
کـراسی کـابەی کـردە، جلەکـەر

هەر هێندە لە چاوی دەروێشـان ون بوو، بە قـوللەیەک هەڵگەڕا، خـورجـێنێکی دزی، تا ڕۆژ هـەلات ئەو دزە دڵ و مـێـشک تاریکە ئەندازەیەک ڕێ ڕۆیشـتـبـوو. هاوڕێیانی بێ گوناە خەویان بەسەردا هاتبوو و نوستبوون، کە بەیانی هەستـان هەموویانیان هێنانە نێو قەلاوە و خرانە زیندانەوە، لەو ڕۆژەوە وامـان بڕیار دا کە ئاواڵەتییە کەس نەکەین و ڕێگای تەنیـایی بگرین و هەر "السلامة في الوحدة" مان ئەگوتەوە.

پارچە

لە هـۆزێ یەکـێک بکا ناپیـاوی
گـەورە و بچـووکـیـان، نامـێنێ ڕێزی
نـابینی گـایەک کـە زەرێکی کـرد
گوناهبـار دەکرێن، گای گوند بە ڕیزی

گوتم: "سوپاس و درووود بۆ خوای گەورە و بێ هاوتا و توانا کە لە کەڵک وەرگرتنی

---
١. خەرقە: مەبەست جلوبەرگی دەروێشانەیە.

نێو دەروێشان بێبەش نەمامەوە، هەرچەندە لە ئاواڵەتییەشیان دوور کەوتمەوە، بەڵام بەو کەڵکە بەهرەدار بووم، من بە درێژایی تەمەنم ئەم ئامۆژگارییە بەکار دەهێنم.

دوو تاکی

کە دیتت پیسێ، لە ناو مەجلیسێ
ئەڕەنجێ دڵی، هۆشیار بێ کەسێ
ئەگەر کانییەک، پڕکەی لە گوڵاو
سەگی تێ کەوێ، گشت ئەبێ گڵاو

٦- سەرگوزەشتە

زاهیدێک میوانی پاشایەکی بوو، کە دانیشتنە سەر نانخواردنێ لەوەندەی کەمتر خوارد کە پێی دەخورا، کە بۆ نوێژکردنێش هەستان، نوێژی لە جاران زیاتر کرد کە دەیکردن تا گومانی چاکەی زۆرتری پێ بەرن.

خانە

کاکی ئەعرابی، ئەترسم نەگەی بە ماڵی کابە
چونکە ئەو ڕێیەی کە پێیدا ئەڕۆی بۆ تورکستانە

هەرکە زاهید هاتەوە ماڵێ خۆیان، داوای خواردنی کرد، بیخوا.

کوڕێکی زیرەکی هەبوو گوتی: "باوکە ئەی تۆ لە داوەتی پاشادا نانت نەخواردووە؟ گوتی: "لە بەرچاوی ئەوان شتێکی وام نەخوارد و زوو دەستم کێشایەوە. کوڕەکەی گوتی: "کەواتە نوێژەکەشت بگێڕەوە، چونکە شتێکی وات نەکردووە بە کەڵک بێت".

پارچە

هونەر ئەخەیتە سەرلەپی دەست و
لەبن باغەڵێ عەیب دائەپۆشی

به پارەی قـەڵب، چۆناو چۆن دەکـرێ

شـتـی دەگـمـەنی، بکڕی و بفـرۆشی

٧- سەرگوزەشتە

لە یادمە کە لە سەردەمی منداڵیمدا، خواپەرستیم ئەکرد. شەوانە نەئەنووستم و لە خزمەت باوکمدا هەڵدەستامەوە، شەوێکیان لە خزمەت باوکمدا دانیشتبووم و بە درێژایی ئەو شەوەش چاوی خەوم نەنابووە سەریەک، قورئانی پیرۆزیشم هەر لەبەر دەستدا بوو.

دەستەیەک لە ڕۆخ ئێمەوە نووستبوون بە باوکم گوت:

"یەکێک لەمـانە سـەرێکی بەرز نەکردەوە هـەر دوو ڕکـات نوێژ بکا، خـەوی بێ ئاگایی ئەمانەی وا بردووەتەوە ئەڵێی مردوون."

گوتی: "ئەی گیانی بابە! ئەگەر تۆش نووستبای باشتر بوو، لەوەی ئاوا بکەویە تاوانی پاشەملە باسکردنیان".

پارچە

مـوددەعی تـەنیـا هەر خـۆی ئەبینێ

بەسـەر عـەیبەی خۆی، پەردەی داداوە

ئەگـــەر خـــوا چاوێ، دیتـنی پێ بدا

کـەمــتـر نـابینێ، لە خـۆی بەو لاوە

٨- سەرگوزەشتە

لە کۆبوونەوەیەکدا بە گەورەیەکیاندا هەڵگوت و زۆریان باسی ئاکاری چاکە و خوو و ڕەوشـتـە باشـەکانی کرد و زۆریـان هەڵنایەوە، دوای مـاوەیەک ڕامـان و دامـان سەری بەرز کردەوە و گوتی: "من هەر ئەوەم کە خۆم ئەزانم!!"

خانه

بەسم ئازاردە، بە چاکی ژمـــاری
دەرەوەت زانیم، ئەی ناخی تاری [1]

پارچە

لە پێش چاواندا، کــەسێکی جــوانم
لە شــەرمی پێــسی، دەروونم ســەر شــۆڕ
خــەڵکی بە جــوانی تاوس، هەڵئــەڵێن
خۆشی شەرمەزار، لە ناشیرینی قاچەکانی، زۆر

٩- سەرگوزەشتە

یەکێک لە پیاوچاکەکانی لبنان لە وڵاتی رۆژئاوادا جێی دیار و بەخاوەن (کەرامەت)[2] ناودار و ناسرابوو، هاتە مزگەوتی شام، لەسەر رۆخی قولەتێنی تارەتان ئەڕۆیشت، لە ناکاو پێی خزی و کەوتە ناو قولەتێنەکەوە، بەڕەنج و ماندووبوونێکی زۆر، تا هاتەوە دەرێ و رزگاری بوو.

کە لە نوێژێ بووەوە یەکێک لە ئاوەڵان پێی گوت: "من گرێیەکم لە دڵدایە" پیر گوتی: "ئەو گرێیە چییە؟" گوتی: "لە یادمە کە رۆژێ تۆ لەسەر دەریای رۆژئاوا ئەڕۆیشتی و پێت تەڕ نەدەبوو و ئەمڕۆش لە بەژنە ئاوێکیدا هێندەی نەمابوو بخنکێی، حیکمەت لەمەدا چییە؟ پیر لەمەدا ماوەیەک کەوتە ڕامان و پاش دامانێکی زۆر سەری بەرز کردەوە و گوتی: "نەتبیستووە گەورەی جیهان "موحەممەدەل موستەفا" - دروودی خوای لێ بێ - ئەفەرمووێ کە (لي مع الله وقت لايسعني فيه ملك مقرب ولا نبي مرسل) واتە، من لەگەڵ خوادا کاتێکم هەیە کە تێیدا ناپرژێمە سەر فریشتە لە خوانزیک و پێغەمبەرە نێردراوەکانیش - و نەیفەرمووە بەردەوام (على الدوام) کاتەکەشی وابوو کە لە "جوبرائیل" جیا

---

١. تاری: تاریک.

٢. قولەتێن: حەوزی ئاوێ

نەدەبووەوە، کاتەکەی تریشی لەگەڵ "حەفسە" و "زەینەب"دا بەسەر ئەبرد "مشاهدة الابرار بین التجلي والاستتار" یانی "دیدەنیی چاکان بۆ خوا، ها لە نێوان دەرکەوتن و دەرنەکەوتنا" خۆی دەردەخات و خۆی ون دەکا.

### خانە

ڕووی خۆت ئەنوێنی و پارێزیش ئەکەی
بازاڕی خۆت و گڕی من خۆش ئەکەی

### هۆنراو

کە ئەوەی خۆشم ئەوێ و ئەیبینم
وام لێ بەسەر دێ، بزرکەم ڕێگام
ئاگر هەڵئەکا و ئاوی پیا ئەکا
بۆیە دەمبینێ، سووتام و خنکام

### دوو تاکی

لە کوڕ ونبووی کرد، یەکێ پرسیار
کە ئەی دەروون ڕوون، ئەی پیری هوشیار

بۆنی کراسیت، لە میسرێوە کرد
بۆ ڕێت بۆ چاڵی، کەنعانێ نەبرد؟

گوتی: "حاڵی مە، برووسکەی دنیایە
دەمێکی ونە و دەمێک پەیدایە

جارێ لە ئاسمان، جێگا نشینم
جار هەیە پشتی، پێی خۆم نابینم

گەر دەروێش لەسەر، یەک حاڵ بمابا
دەبوایە ئاگای، لەولاش[1] بڕابا

---

١. لەولاش: مەبەست ڕۆژی قیامەتە.

١٠- سەرگوزەشتە

لە مزگەوتی (بەعلەبەگ) چەند وشەیەکی ئامۆژگاریم بە هەندێ کەسانی ژاکاو و دڵ مردە دەگوتەوە کە ڕێیان بە عالەمی وێنە بە ماناکردن نەبردبوو، سەیرم کرد پشووم بڕ ناکا و ئاگرم لە داری تەڕیان بەر نابێ و نایگرێ، زۆرم غەم لەپەروەردە کردنی ئێستران و ئاوێنە دانان لە بەرامبەر کوێران خوارد، بەڵام دەرگا و دەروازەی مانا و مەبەستان هەر لەسەر پشت بوو و کرابووەوە و زنجیرەی قسانیش هەر بەردەوام بوو و تا ئەو جێیەی کە ئەمگوت "نحن أقرب اليه من حبل الوريد" ئێمە لە شادەماری ملی لێ نزیکترین.

پارچە

دۆست لە گیانم، نزیکترە لە من

سەیریش ئەمەیە، کە من لەو دوورم

چبکەم؟ نازانم، بەکێ بڵێم یار

ئەو لە تەک منە و من لەو مەهجوورم

من شەرابی ئەم وتار و قسە و وشانە مەست و نیوە بادەیەکی ئەو وتارەشم هەروا بە دەستەوە بوو کە ڕەوەندێک - ڕێبوارێک - بەلای کۆڕ و دانیشتنەکەدا تێپەڕی و دوا سووڕی کۆڕەکە زۆری کار تێ کرد.

نەعرەتەیەکی وای لێ دا، کە ئەوانی تریش لەگەڵ ئەودا وەجۆش و خرۆش هاتنەوە و خاو و خلیچکەکانی کۆڕەکەشی ورووژاندنەوە، گوتم: (سوبحانەڵڵا) دوورە ئاگادارەکان نزیک و نزیک و ئامادە بێ هۆش و گۆشەکانیش دوور.

پارچە

کە تێ نەگەیی، لەقسان گوێ دێرێ

هێز لە وتەبێژ، داوا مەکە تۆ

مەیدانی پانی، ئارەزوو بێنە

تا لێدا پیاوی، وتەبێژ لە گۆ

١١- سەرگوزەشتە

شەوێک لە بیابانی مەککە، لەبەر بێ خەوی پێی ڕۆیشتنم نەما، سەرم نایەوە و بەحوشترەوانەکەم گوت: "وازم لێ بێنە!"

پارچە

دەبێ پێی پیادەی، پیاوێکی هەژار...
چۆن بێ کە حوشتر، لە ڕێ بێ بێزار
تا لاواز ئەبێ، لەشی قەڵەوێک
لاوازێ ئەمرێ، لە سەختی دژوار

گوتی: برادەر!، کابەت لەپێشە و دز لە پاش، ئەگەر بڕۆی گیان دەرباز ئەکەی و ئەگەریش بنووی ئەمری، نەتبیستووە کە گوتراوە:

خانە

لە ژێر داری موغەیلان، خۆشە خەوی بیابان
لە شەوی ڕۆینیدا، ئەبێ وازبێنی لە گیان

١٢- سەرگوزەشتە

خواپەرستێکم لە کەناری زەریادا دیت، برینی پڵنگێی پێوە بوو و بە هیچ داوودەرمانێک چاک نەدەبووەوە و چارە نەدەکرا و بەو ئازار و دەردەشەوە هەر سوپاسی خوای گەورە و بەتوانای ئەکرد، لێیان پرسی: "ئەوە سوپاسی چی ئەکەی؟"

گوتی: "سوپاسی ئەوە کە بە دەردێ گرفتارم نەک بە گوناهێ."

پارچە

گەر بە کوشتم دا یاری شیرینم
وا مەزانە من، غەمی گیانم بێ

دەڵێم چ گـوناهێک، لە من رووی داوە
دڵ شکاوە لێم؟، دەک نەمـــــانم بێ

١٣- سەرگوزەشتە

دەروێشێک پێویستییەکی هاتە پێش، کلیمێکی لە ماڵە دۆستێکی خۆی دزی، دادوەر فەرمووی: "دەبێ دەستی ببڕدرێ، خاوەن کلیمەکە، تکای کرد و گوتی ئەوە گەردەنیم ئازاد کرد.

دادوەر گوتی: "بەتکای تۆ واز لە شەرع ناهێنم" وەڵامی دایەوە:

"راست دەفەرمووی، بەڵام هەر کەسێک شتێک لە ماڵی وەقف بدزێ، دەستبڕینی لەسەر نییە، چونکە "الوقف لايملك" و وەقفیش بە خاوەن ناکرێ و هەرچییەکیش لە موڵکی دەروێشانە وەقفی خاوەن پێویستانە.

دادوەر ئەم قسەیەی پەسند کرد و دەستی لێ هەڵگرت و زۆریشی سەرزەنشتی دزەی کرد کە جێ نەمابوو دزیی لێ بکەی تەنیا لە ماڵی دۆستێکی وانەبێ؟، وەڵامی دایەوە: "گەورەم، نەتبیستووە کە چییان گوتووە؟ لە ماڵی دۆستان بدزە و لە دەرگای دوژمنان مەدە".

خانە

لە تەنگانەدا هەرگیز خۆ مەخە، ژێر باری غەمێ
پێستی دوژمنان بگروو[1] و بۆ دۆستی بکە پێستێنە[2]

١٤- سەرگوزەشتە

پاشایەک لە خواپەرستێکی پرسی: ئاخۆ هیچت لە ئێمەوە وەبیر دێتەوە؟ وەڵامی دایەوە: "بەڵێ، هەر کاتێکی کە خوای گەورە و بەتوانام لە بیر بچێتەوە، تۆم دێتەوە یاد"

---

١. بگروو: کەوڵی کە، پێستی لێ بکەوە.

٢. پێستێنە: فەروو.

خانە

خوا، یەکێ دەرکا لە دەرگانەی خۆی، هەر ڕاکەیەتی بێرو بەوێدا
گـــــەر ئاوڕیشی لێ بداتەوە، نـایەڵێ بـڕوا بێـــــرو بـەوێدا

۱۵- سەرگوزەشتە

یەکێک لە پیاوچاکان، لە خەونێیدا، پاشایەکی لە بەهەشتێ و خواپەرستێکی لە دۆزەخدا دیت، پرسی: هۆی بەرزی پلە و پایەی ئەوە و نزمی ئەمەیان چییە؟ کە من بە پێچەوانەی ئەمەوەم چاوەڕێ ئەکرد". دەنگێک هات، کە ئەم پاشایە بەلایەنگرینە دەروێشـان لە بەهەشـتە و ئەو خـواپەرسـتـەش بە لایەنگری و نزیکبـوونەوەی لە پاشایان لە دۆزەخە.

پارچە

دەڵـق و تـەزبـێح و پـنکـت[1]، بـۆ چیــــــــیـــــــەە؟
کــــە خـــۆت لە کـــاری خـــراپ، دوور نـەگـــری
پێـویسـتـیت نیـەی، کـڵاوی خوری لـەسەرکـەی برا
وەک دەروێشـان بە و کڵاوی شـارەیار بکەرە سـەری

۱٦- سەرگوزەشتە

دەروێشێک بەسەری ڕووت و پێی پەتی، لەگەڵ کاروانێکی حیجازدا، لە کووفە هاتە دەر و بوو بە هاوڕێی ئێمە، نواڕیمێ بەناز و خەرامان ئەڕۆیی و ئەیگوت:

پارچە

نە لە حـوشـتـرێ سـوارم، نەوەک ئەو لەژێر بارم
نە خـاوەنی ڕەعـیـەت و نە غـولامی شـەهـریارم
نـەغـــەم و پەرێشــــانیم، هەیە نەڕەنج و ئـازار
پشــووی ئاسـوودە ئەدەم، ئەژیم بەجـوانی بـەهار

۱. پنک: بەرگی پینەدار.

حوشتر سوارێک پێی گوت: دەروێش! ئەوە ئەچییە کوێ، بگەڕێوە! لە سەختی و ناخۆشییاندا ئەمری". گوێی نەدایە، هەی پێیان کرد، بەرەو بیابانێ.

کە گەیشتینە "نەخلەی مەحمود"[1] ی، کابرای دەوڵەمەند ئەجەلی گەیشتە سەرێ، دەروێش گەیشتە پشت سەری و گوتی:

"من لە سەختی و ناخۆشییاندا نەمردم، تۆ لە سەر پشتی حوشترەکەت مردی".

خانە

لەسەر نەخۆشێ، کەسێک ئەگریا بە درێژایی شەو
بەیانی نەخـــــۆش چاک بۆوە و مـــــرد ئەو

پارچە

زۆر ئەسپی خۆشڕەو، لەڕێ بەجێ ما
کەچی کەری شەل، گەییە مەنزڵگا
زۆرمان تەندروست، لە ژێر خاک ناشتن
کـــــەچی بریندار، نەمـــــرد و ژیا

١٧- سەرگوزەشتە

پاشایەک خواپەرستێکی نەزانی بانگ کرد، خواپەرست بیری کردەوە کە دەرمانێک بخۆم تا لەڕولاواز ببم، بەڵکە پاشا بیروباوەڕی لەبارەم زیاتر بێ. وا ئەگێڕنەوە، دەرمانەکەی خوارد، دەرمانەکە ژەهرێکی کوشندە بوو، مرد.

پارچە

ئەوەی وەک فستەق، بەکاکڵەم زانی
کەچی وەک پیاز، بەرگ لەسەر بەرگە
ئەو خواپەرستەی، روو ئەکاتە خەڵک
لە نوێژا پشـــتی، ئەکـــاتە ڕووگـــە[1]

---

١. قۆناغێکە لە نێوان کووفە و مەککەدا.

دوو تاکی

تا عــەمــرو و بەکــر و زەید بپــەرســتی
دۆســتی مــەخــوازە، لە کــار و هەســتی
کە بەندە خوای خۆی، خواست بۆ ڕزگاری
دەبێ هەر ئەویش، بناسێ یەکـــجـــاری

١٨- سەرگوزەشتە

کاروانێکیان لە ناو خاکی یۆناندا ڕووت کرد، کوتاڵ و ماڵێکی بێ ئەژماریان برد، بازرگانەکان دەستیان کرد بە گریان و زاری، خواو پێغەمبەریان ئەهێنانە تکاکاری، سوودی نەبوو و کەڵکی نەگرت.

خانە

هەرکاتێ سەرکەوت، ڕێگری بەدکار
گوێی لێ نییە کاروان، چەند بکا

هاوار "لوقمان" ی حەکیم لەگەڵ کاروانەکە بوو، یەکێک لە کاروانچییەکان پێی گوت: "چەند وشەیەکیان لە حیکمەت و ئامۆژگارییەکانت بۆ بڵێ، بەڵکو ئەوە خوایە و دەست لە ماڵەکەمان هەڵئەگرن، چونکە جێی داخ و کەسەرێکی زۆرە ئەم کوتاڵ و ماڵە بەموفت بڕوا".

"لوقمان" گوتی: "حەیفە وشەی حیکمەت بەمانە بگوترێ".

پارچە

کــە ئاسنێک ژەنگی، لێ دا و ڕزاندی
هەرگیز لاناچێ، بە زاخاوی ژەنگ
بۆ دڵ ڕەش، وەعز دادان بێ سوودە
مێخی ئاسنین، ناچێتە خوار لە سەنگ

---

١. ڕووگە: قیبلە.

دوو تاکی

له ڕۆژی خۆشی، لێکەوتەی ڕۆژگار، قەت لەبیرمەکە
کــە دڵدانەوەی هــەزاران ڕۆژێ، بەلاوەگـــێـــڕە
گەر بێنەوایە، هات بەدزییەوە، شتی لێ خواستی
بیــدەیە دەنا، زۆردارێک دێت و ئەیبــا بێ قــیــڕە

۱۹- سەرگوزەشتە

هەرچەندێک پیری مەزن "ئەبول فەرەج شەمسەدین کوڕی جوزی" - خوای لێ ڕازی بێت - فەرمووی، کە واز لە گوتنێ بێنم و گۆشەنشین و تەنیا بم، بەڵام لاوەتی و سەرەتای هەرزەکارییەم تاویان لێ سەندبووم و مەستی حەز و ئارەزووش هۆشمی فڕاندبوو، ناچار بە پێچەوانەی بڕیاری پەروەردەکاری[1] خۆم هەنگاوم دەناو لە تێکەڵی و گوێ ڕاداشتن و سروود گوتنێ و تێکەڵاوبوونم لەگەڵ دەروێشان بەشی خۆمم وەردەگرت و کە ئامۆژگارییەکانی پیریشمم وەبیر دەهاتنەوە دەمگوت:

خانە

گەر قازی لەگەڵ مە دانیشتبا دەستی بادەدا
داڕۆغەش ئەگەر مەی بخواتەوە، سەرخۆش بەردەدا

هەتا شەوێک لە کۆڕ و دانیشتنێک نزیک بوومەوە و گۆیندەیەکم لەناویاندا دیت.

خانە

وەک دەمــاری گیــان دەربێنــێ، نەغمــەی ناســازی
لە ئاوازی باوک مردە ناخۆشترە، دەنگ و ئاوازی

تاوێک پەنجەی هاودەم و دانیشتوان لە ناو گوێ و جارێک لەسەر لێوان بوو، کە یانی بێ دەنگ بە، وەک عەرەب دەڵێن:

---

۱. مەبەستی ئەبول فەرەجە.

هۆنراو

بە دەنگی گوتنی خۆش زۆر دڵ خۆشین
بەڵام بە دەنگی تۆی وا دەنگ ناخۆش، بێدەنگ بی خۆشین

خانە

لە گوێگرتن لێت، کەس نابیە[1]، خۆشی
مەگەر ئەو کاتەی دەڕۆی، خامۆشی

دوو تاکی

کە تێی هەڵکرد و بەرز دەنگی هەڵدا
بەخانە خوێم گوت، لە ڕێگای خودا

پەمۆ بخە گوێم، هاوارە لە خۆم
یا دەرگا بکەوە، بچمە دەر بڕۆم

بەکورتی، دڵی دەروێشانم ڕاگرت و شەوەکەم بە ئازار و ناخۆشییەکی زۆرەوە گەیاندە ڕۆژ و گوتم:

پارچە

بانگدەر بانگی دا، بانگی لەناکاو
نازانێ چەندی بەسەرچووە شەو
درێژایی شەو لە مژۆڵم[1] بپرسە
کە نەچۆتە ناو هەر دووچاوم خەو

بەیانی بۆ پیرۆزییە مێزەرم لەسەر داگرت و دینارێکیشم لەبەر پشتێندێ هێنایە دەر و لە پێش گۆیندەم دانا و لە باوەشێم گرت و زۆریشم سوپاس کرد.

١. نابیە: نابیستێ

دۆستان ئەم ڕەفتارەی منیان بە پێچەوانەی خوو و ڕەوشت هاتە بەرچاو و بەبێ ئەقڵیم پێئەکەنین، یەکێکیان لەناو ئەواندا زمانی تەشەر و گازەندانی دەرکێشا و دەستی بە تانووتان کرد.

کە ئەم هەڵسوکەوت و ڕەفتارەت وەکو بلیمەتان نەبوو کە خەرقەی دایە گۆیندەیەکی وا، کە لە هەموو تەمەنیدا درهەمێکی لەناو لەپیدا نەبووە.

دوو تاکی

لێرە بەو لاوە، گۆیندەی هەژار
کەس لە هیچ جێیەک، نەیدیوە یەک جار

کاتێک کە دەنگی، لە زار هەڵستا
مووی لەشی هەمووان، ڕاستبۆوە و وەستا

مەلی هەیوانێ، لە ترسان فڕی
مێشکی مەی برد و گەرووی خۆی دڕی

گوتم: "وا چاکە زمانی تەشەر و گازەندان کورت کەیەوە و دای بخەی، چونکە من کەورایەتیی ئەو پیاوەم بۆ دەرکەوت، گوتی: "ئادەی لە چۆنیەتیی ئەمەم ئاگادار بکەوە! تا منیش بەو جۆرە خۆمی لێ نزیک بکەمەوە و بچم داوای لێبووردنی لێ بکەم".

گوتم: "بەهۆی ئەوەی کە پیری گەورەم گەلێک جارانی فەرموو کە واز لە گوتن و گۆرانییان بێنم و زۆریشی ئامۆژگاری چاک و بەرز و بەنرخ کردووم، کەچی گوێم نەدایە، هەتا ئەم شەو چارەنووسی پیرۆز و بەخت و ئیقبالی بڵندم بۆ ئەم جێگایەی ڕێنوێنی کردم و لەسەر دەستی ئەم گۆیندەیە تۆبەم کرد، کە جارێکی تر هەتا ماوم نزیکی ڕیزی سروودبێژ و گۆیندان نەکەوم.

---

١. مژۆڵ: برژانگ

### پارچە

ئاوازی خۆش، لە دەمی وەک غونچە و لێوی شیرین
هەڵستێ یا هەڵنەستێ، دڵ هەر ئەفڕێنێ
بەڵام مەقامی عوششاق و نەهاوەندو حیجاز
لە گەرووی گۆیندەی دزێودا[1]، جوانی ناهێنێ

۲۰- سەرگوزەشتە

بە "لوقمان" ی حەکیمیان گوت: "خوو و ڕەوشتی باش لە کێ فێربووی" گوتی: "لە بەدخوو و بەدڕەوشتان، چونکە هەر چییەکی لەوانەوەم پەسند نەکرد، خۆم لێ پاراست و لێی دوورکەوتمەوە"

### پارچە

بە گاڵتەوەش ئەگەر وشەیەک گوترا
پەندێکی هەر لێ وەرئەگرێ، خاوەن هۆش
بەڵام سەد دەرکی حیکمەت لای نەزانێ
کە والا کەی بەگاڵتەی دێتە بەر گۆش

۲۱- سەرگوزەشتە

ئەگێڕنەوە خوا پەرستێک هەموو شەوێ (۱۰) دە لەگەنی خواردنی ئەخوارد و تا بەیانیشی بە نوێژکردنێوە ڕائەبوارد، پیاوچاکێک ئەمەی بیستەوە و گوتی: ئەگەر نیو نانی خواردبا و نووستبا گەلێک لەوە باشتر بوو.

### پارچە

دەروون لە خواردنی خۆراک خاڵی کە
تا نووری عیرفان، ببینی ئەو دەم

---

۱. ناشیرین

بۆیە دەروونت خاڵییە لە حیکمەت
هاکا خواردنت هاتەوە ناو دەم

٢٢- سەرگوزەشتە

پیاوێکی ڕێ لێ ونبوو بە بەخشایشی خوا چرای ڕێی سەرکەوتنی دیت و هاتە ڕیزی پیاوچاکانەوە و لە پیرۆزی و پاکیی گیانی دەروێشانەوە، ڕەوشتە نابەجێ و ناپەسندەکانی هەموو بەچاکە گۆڕان. وازی لە هەوا و هەوەس هێنا و دەستی لێ هەڵگرتن، بەڵام زمانی تانە و تەشەر لێدەرانی هەر بە دواوە و لەسەر درێژ بوو، کە هەر لەسەر خوو و ڕەوشتی جارانە و باوەڕیان بە وازهێنانی لە جیهان و تۆبەکەی نەکرد.

خانە

به عوزر و تۆبە لە عەزابی خوا، ڕزگارت ئەبێ
بەڵام ناتوانی، لە زمانی خەڵکی خوا ببی ڕزگار

بەزمانیان نەوێرا و تاقەتی پێیان نەشکا و سکاڵای ئەم هەڵوێستەیانی بردە لای پیری تەریقەت و گوتی: "ئازاری زمانی خەڵکی هەراسان و دڵگیری کردووم".
پیر گریا و گوتی: "چاکە و سوپاسی ئەم خۆشییە چۆن ئەدەیتەوە، کە لەوە چاکتری، کە گومانت پێ ئەبەن"

پارچە

چەند دەڵێن بڵێن، بەدکار و حەسوود
عەیبەی من، کە من کەسێکم هەژار
جارێک بۆ باسی خراپەکانم، لێک کۆئەبنەوە
جارێک بۆ ڕشتنی خوێنم، ئەکەن کار
باش بی و خراپەت، بڵێن باشترە
نەوەک خراپ بی و بە چاکیت کەن دیار

بەڵام کە بۆچوونی باشەی خەڵکی دەرهەق بەمن کەییوەتە ئەوپەڕی و من هەر لە کەموکورتییەدام، ڕەوایە بیر بکەمەوە و نەخۆش بکەوم.

خانە

ئەمەی ئەمزانی، گەر بمکردایە
ئەبوومە زاهید، پاک ڕەوشت مایە

هۆنراوە

(خۆم شاردۆتەوە، لە چاوی جیران
بەدزی و ئاشکرام، خودایە حاڵ زان)

پارچە

لەبەر خەڵک دەرگا، لەخۆم دائەخەم
تا دیار نەبێ، عەیبم لای کەسان
دەرگا پێوەدان بێ کەڵکە... چون خوا
زانای گشت کارە، ئاشکرا و پەنهان

٢٣- سەرگوزەشتە

گلەییم بردە بەر یەک لە پیران، کە فلان بەخراپەی گەواهی لەسەر من داوە، گوتی: "تۆ بە چاکە شەرمەزاری بکەوە"

هەڵبەست

تۆ ڕەوشت باش بە، هەتا دوژمنت
بۆ بەدگۆیی تۆ، نەیمێنی ماوە
کە بوربوت دەنگی، ڕاستەوخۆ دەرچوو
کەی بە دەست موتریب، گوێی ڕاکێشراوە

٢٤- سەرگوزەشتە

لە یەکێک لە پیرانی شامیان پرسی: تەسەووفی ڕاستەقینە چییە؟

گوتی: "لەمەوپێش دەستەیەک بوون بە دیمەن پەرت و بڵاو لە جیهاندا و بەمەبەستیش گرد و کۆ و ئەمڕۆش کەسانێکن بە ئاشکرا گرد و کۆ و لەناوەوەشدا پەرت و بڵاو".

### پارچە

هەردەمــــەو دڵت بۆ شـــوێنێ بڕوا
لە تەنیـــایی ژین، خـــۆشی نابینی

کە هەتبـوو کشت و بازرگانی و مـاڵ
دڵت لای خـوا بێ، گـۆشـەنشـینی

٢٥- سەرگوزەشتە

لەبیرمە شەوێک بە درێژایی شەو، لە کاروانێکدا شەو ڕۆییم کردبوو و بەرەبەیانی لە ڕۆخ بیشەڵانێکەوە نووستم، شەیدا (عاشق) ێک کە لەم سەفەرەدا، هاوڕێمان بوو، هاوارێکی کرد و ڕێی بیابانی گرتە بەرو پشووێک ڕانەوەستا.

کە ڕۆژ بووەوە پێم گوت: "ئەوە چیت بوو؟" وەڵامی دایەوە:

"دیتم بولبولان لەسەر درەختان و کەو لەسەر کێوان و بۆق لەناو ئاوان و گیانلەبەران لەناو بیشەڵاناندا کەوتبوونە ناڵە و هاتوهاوار: وام بەبیردا هات، کە پیاوەتی نییە هەموو ئەمانە لە تەزبیحاتی هێنانی ناوی خوادابن و منیش لە خەو و فەرامۆشیدا."

### پارچە

دوێنێ بولبـولێک، ئەیخـوێند بەیانی
لێی سەندم ئۆقـرە و تین و بیر و هۆش

یەک لە دۆستـانی گیـانیم لەگەڵ بوو
سۆزەکەی منی، پەڕیە هۆش و گۆش

پێی گوتم: لای خەڵکی ئەمە ڕوون نییە
مەل دوعـاگۆ بێ و منێکیش خـامۆش

٢٦- سەرگوزەشتە

جارێک لە سەفەری حیجازدا لەگەڵ تاقمە لاوێکی هاودەم و هاوکار بووم، کاتیان

به ورده گـوتنی به سـۆزەوە بەڕێ ئەکـرد و هـەڵبـەسـتی ئەوین و دڵدارییـان ئەخوێندەوە.

خواپەرسـتێکمـان لەگەڵدا بوو، کە دژی حـاڵی دەروێشـان و بێ ئاگا لە دەرد و ئێشیان بوو، کە گەیشتینە "نەخلەی بەنی هیلال" منداڵێکی قولەڕەشکەمـان لەناو خێڵە عارەبانەوە لێ پەیدا بوو، کە تێی هەڵکرد و دەنگ و ئاوازی تێرا هەڵدا، مەل و باڵندەی لە هەوا هێنانە خوار، حـوشـتـری خـواپەرسـتـەکـەم دیت کـەوتە سـەمـاو هەڵپەڕکێ و خوا پەرستەی هەڵدا و ڕێی بیابانێی گرتە بەر، گوتم:

"ئەی پیـر!! – سروودی ئەو منداڵە، هەستی چوار پێی هەژاند کـەچی تۆ هەروا نەگۆڕای و تەکانێکی پێ نەدایت و نەی بزواندی"

هەڵبەست

ئەزانی چی بۆ گـوتم، ئەو بولبـولەی سـەحـەری
قەت پێت ناڵێن ئادەمی، گەر لە عەشق بێ خەبەری

حوشتـر بە شیعری عارەبان، کەوتۆتە بەزم و سەما
گــەر تۆ شـــۆڕێکت نەبێ، وا دیارە جـانەوەری

هۆنراو

(کـــە ڕەشـــەبا هـات بەســـەر وڵاتا
دار خـوار ئەبێـتـۆ، نەکـو بەردی ڕەق)

دوو تاکی

بە زیکری هـەرچی دەبیینی لە جـۆشـە
دڵێک ئەیزانێ، خـاوەن هۆش و گۆشـە
نەهـەر بولبـول لە بۆ گـوڵ خـوێنـەوانە
لە ویردی ئەودا، هـەر درکـێک زمـانە

٢٧- سەرگوزەشتە

یەکێک لە پاشا عەرەبەکان، کە تەمەنی بەرەو کۆتایی هات جێنشینی نەبوو، ڕای

سپارد کە یەکەم کەسێک لە بەرەبەیاندا لە دەروازەی شارەوە هاتە ژوورێ، تاجی پاشـایەتیی بکەنە سەری و کـاروباری هەڵسووڕاندنی کیـشوەری باوێنە بەر دەست و بەری.

وا رێک کەوت، یەکەمین کەسێک کە هاتە ژوورەوە، دەرۆزەکەرێک (سواڵکەر) بوو کە لە هەموو تەمەنیا پاروو پارووی بە دەرۆزە پەیدا ئەکرد و پینە لەسەر پینەی لە جلوبەرگە شڕ و وڕەکانی ئەدا.

گەورە پیاوانی دەوڵەت و پیاوماقووڵانی دەربار راسپاردەکەی پاشایان بەجێ گەیاند، کلیلی شووره و قەڵات و گەنجینانیان دایە دەستی، ماوەیەکی پاشایەتی کرد، فەرماندارانی دەوڵەت، سەری سەرپێچییان لە ڕوودا هەڵبڕی، پاشایانی دەوروبەریش، لە هەموو لایەکەوە کەوتنە دوژمنایەتییەی و بۆ بەربەرەکانیکردنیشی لەشکریان ئامادە و تەیار کرد و هەندێ لە فەرمانڕەوایانی دەوروبەری خۆشیان کەوتنە یاغیبوون و سەرپێچیکردنی. سوپا و گەل پێکداهاتن، وڵات زۆر لایەنی لێرەو لەوێ لێ بووەوە و لە دەست دەسەڵات دەرچوون. دەروێشی دەرۆزەکەر بەو رووداو و کارەساتە هەمیشە دڵگیر و دڵ بریندار و پەرت بوو.

تا یەکێک لە کۆنە دۆستەکانی کە ئاواڵی سەردەمی دەروێشییەی بوو و لە سەفەرێ دەگەڕایەوە و لەو جێ و پلە و پایەیدا دیت پێی گوت: "سوپاس بۆ خوای گەورە و بەتوانا، کە بەخت و ئیقباڵی بڵندت یاوەرت بوو و گوڵت لە دڕک و دڕکت لە پێ هاتە دەر گەیشتیە ئەم پلە و پایە، "ان مع العسر یسرا" واتە لەگەڵ هەر تەنگانێکدا خۆشییەک هەیە"

خانە

گوڵ تاوێک گەشە و تاوێک پەرپووتە

دار تاوێک پۆشتە و تاوێکی رووتە

وەڵامی دایەوە: "ئەی برادەری ئازیز! سەرەخۆشیم لێ بکە نەک پیرۆزبایی، ئەو کاتەی کە ئەتدیتم دەرۆزەم دەکرد هەر غەمی نانێکم بوو، ئەورۆکەش غەمی دنیایەکم بەکۆڵەوەیە".

دوو تاکی

ئەگـــەر دنیـــا نەبێ، بۆی دەردمـــەندین
ئەگـــەر هەشـــبوو، ئەوا پێی پایەبەندین

بەڵا کـــوا لەو خـــراپتـــر، لەم جـــیـــهـــانە
لە بۆ دڵ هەر دوولای، هـەر دەرد و ژانـە

پارچە

گـــەر ئارەزووتە، ســـامـــان بخـــوازی
هەر قـــەناعـــەتە، ســـامـــان و خـــۆشی
سامـاندار هە تا چۆک[1] زێڕ ببەخشێ
تـا چاکـــەی ئەوت، نەکـــەوتە هۆشـی

لە پیاوی گەورەم، زۆر جـار بیستـووە
لە چاکـــەی دارا[2]، باشـتـرە دەروێشی

خانە

گـــەر بارام بکا، نێـــچـــیـــرێ بریان
نابێـتـــە قـــاچی کـــوللەی مـــیـــروولان

٢٨- سەرگوزەشتە

ئەبو هورەیرە - رەزای خوای لێ بێ - هەموو رۆژێ دەچووە خزمەت پێغەمبەر - دروودی خوای لێ بێ - ڕۆژێکیان فەرمووی: ئەی ئەبا هورەیرە "يا أباهريرة زرني غبا تزدد حبا" کەم کەمەم سەر لێدە، تا خۆشەویستیت زیاتر بێ.

١. چۆک: ئەژنۆ
٢. دارا: سامـاندار

بەخاوەن دڵێکیان گوت: ئەوەتا خۆر بەو جوانیەشییەوە کە هەیە، کەچی نەمان بیستووە تا ئێستا کەسێک عاشقی بێت و دڵداری لەگەڵدا بکا. گوتی: لەبەرئەوەیە هەموو رۆژێ لە بەرچاوانە، ئەدی ئەوە نییە کە زستانان دیار نییە چەند خۆشەویستە.

پارچە

سەردانی خەڵکی، نابێتە عەیبە
ئەوەندە نەبێ، کە پێت بڵێن بەس
ئەگەر تۆ بۆ خۆت، خۆت سەرزەنشت کەی
هەرگیز سەرزەنشت، نابیسی لە کەس

٢٩- سەرگوزەشتە

گەورە پیاوێک (با) ی (پێچپێکی) بەسکیدا هات، پێی ڕانەگیرا بە ناچاری لێی بەرەڵلا بوو، گوتی: "ئەی دۆستان! ئەوەی کە کردم بەدەست خۆم نەبوو و لێم ناگیرێ و ئاسوودەییەکیش بەمن گەیشت، ئێوەش بە گەورەیی خۆتان ئەو پۆزشەم لێ قبوڵ بفەرموون.

دوو تاکی

سک زیندانی بایە، ئەی پیاوی ژیر
پیاوی ژیر، (با) لە زیندانا، ناکا گیر
لە (با) گەڕێ، گەر لە سکتا جووڵا
با دەرچێ چونکە، بۆ دڵ بارێکە بەلا

خانە

میوانی ڕووترش، کە ویستی بڕوا
وازی لێ بێنە، لێی مەگرە ڕێگا

٣٠- سەرگوزەشتە [١]

یەکێک دۆستێکی هەبوو کە لە دیوانی شادا ئیشی دەکرد ماوەیەکی زۆر تێپەڕی، ڕێک نەکەوت پاشا بیبینێ، یەکێک پێی گوت: "فلانت لەمێژە نەدیوە". وەلامی دایەوە: "کە من خۆم نامەوێ بیبینم".

وا ڕێک کەوت یەکێک لە خزمانی ئەو لەوێ بوو، گوتی "چ گوناهێکی کردووە، کە ئاوا لە دیتنێی ساردی؟" وەلامی دایەوە: "گوناهی نەکردووە، بەلام دۆستی دیوان کاتێک ئەبینرێ کە لەسەر ئیشەکەی لابرا و بێکارە بوو".

پارچە

لە سایەی پایە و بوون و گیر و دار
لە ئاشنا و ڕۆشنا، ئەبن بێ خەبەر
ڕۆژی داماوی و لە کار دەرکران
دەردی دڵ دێنن، بۆ لای دۆست یەکسەر

٣١- سەرگوزەشتە

جارێکی لەناو دۆست و هاودەمەکانمدا لە "دیمەشق" ێ، دڵتەنگییەکم بەسەرداهات، رووم لە بیابانی "قودس" ێ کرد و خووم بە گیانلەبەرانەوە گرت، کاتێک بوومە دیلی فەرەنگان، لە هەلکەندنی خەندەکی تەرابلوسێ لەگەڵ جوولەکاندا بێگارییان پێ ئەکردم، یەکێک لە سەردارانی "حەلەب" کە ناسیاویی پێشینەمان پێکەوە هەبوو و بەوێدا تێپەڕی و منی ناسییەوە، گوتی: "ئەوە چییە و چۆن کەوتوویە ئێرە؟"
گوتم:

پارچە

لە دەست خەڵکانێک، چوومە دەشت و کێو
لەوێ هەر پەنام، بۆ یەزدان ئەبرد

---

١. ئەم سەرگوزەشتەیە جێ گۆڕکێی پێ لەگەڵ سەرگوزەشتەی (٢٨) دا پێ کراوە کە نازانم چۆناو چۆنە و بۆ وای لێ هاتووە. -غەریب پشدەری-

سەیری چەند نەحسە، چارەنووسی وا
سەر بێنمە دەرگا و ناو ماڵی نامەرد

خانە

زنجیر لە پێ بم، لەگەڵ دۆستانا
نەک لای بێگانان، لەناو بێستانا

بەزەیی پێمدا هاتەوە و بە ١٠ دینارانی کڕیمەوە و لە بەندایەتییە فەرمنگانی ڕزگار کردم و لەگەڵ خۆیدا بردمیەوە (حەڵەب)ێ و کیژێکی هەبوو و لەسەر سەد دینار مارەیی، لێی مارە کردم.

پاش ماوەیەک، کیژەی بەدخوو و ناشیرن و دزێو، دەستی بە زماندرێژییە کرد و ژیانی پێ تیرە و تاڵ کردم.

دوو تاکی

هاوسەری بەدخوو، لەماڵ پیاوی چاک
ئەیکاتە دۆزەخ، لە هەمووان تاک تاک
زینهار لە ژنی بەدخوو سەد زینهار
وقِنا ربنا عـــــــذاب النار

هەموو جارێک زمانی تانە و تەشەرانی درێژ دەکرد و دەیگوت:

"تۆ هەر ئەوە نیت کە باوکم بە ١٠ دینارانی کڕییەوە؟ گوتم:

"با، بەڵێ.. بە ١٠ دینارانی من لە بەندایەتییە فەرمنگان ڕزگار کرد و بە سەد دینارانیشی کردمە بەندە و دیلی دەستی تۆ.

هەڵبەست

پیاوێک مەڕێکی، لە دەمی گورگ هێنایە دەرێ
کە ئەیهێشت بیخوا، زووی گەییە سەرێ

شـــەوێک کـــێـــرێکی، بەملدا مـــاڵان
گـــیـــانی مـــەڕەکـــە، گـــوتی، بە ناڵان

لـە چنگی گـــــورگ، دەربازت کـــــردم
خـــۆت بووی بەگـــورگ و لەناوت بردم

٣٢- سەرگوزەشتە

یەک لە پاشایان لە خواپەرستێکی، کە خاو و خێزانێکی زۆری هەبوو پرسی: "کە کاتە بەنرخ و خۆشەویستەکانی خۆت چۆن بەسەر دەبەی؟"

وەڵامی دایەوە: "شـەو بە ناورانەوە و بەیانیش بە کـاری پێـویسـتی و بـەدرێژیی ڕۆژیش بە دوای پەیداکردنی خەرجییەوە بەسەر دەبەم".

پاشـا لە کـرۆکی ئامـاژەکـانی گـەیشت و فـەرمـووی: "مـووچەو بەراتـی ژیانی بۆ دانێن و بۆی ببڕنەوە، تا باری خێزانی لەسەر دڵ لابچێ".

دوو تاکی

ئەی گـــیـــرۆدەی مـــاڵ و منـاڵ
بێـرەوبەوێدا، پەرت مـەکـە خـەیاڵ
گوێ مـەدە مناڵ، نان و بـەرگ خـۆراک
بژێویـان بۆ دێت، لەلای خـودای تـاک

تـەواوی ڕۆژێ، کـــــە ئـەدەم بڕیـار
شـــەو نوێژان کـەم، بۆ پەروەردگـــار
کــە نوێژم دابەست، دێتـە خـــەیاڵم
بەیانـی چ بخـــۆن، مـــاڵ و منداڵم؟

٣٣- سەرگوزەشتە

خـوابەرسـتـێک لە بیشـەڵانێکدا دەژیا و گەڵای دارو درەختـانی دەخـوارد، پاشـا بۆ دیدەنییەی چووە لای و پێی گوت:

"ئەگـەر حەز دەکـەیت و بە چاکی دەزانی، وەرە شـار و لەوێ جێیـەکت بۆ تەرخـان

دەکەم کە بۆ تاک بوونەوە و خواپەرستییە دەست بدا و خەڵکیش کەڵک لە هەناسەی پڕ پیت و فەڕتەوە وەربگرن و لەکردارە چاکەکانتەوە پەیڕەوی بکەن."

خواپەرست ئەم قسەیەی پاشای بەدڵ نەبوو و ڕووی لێ وەرگێڕا، یەکێک لە وەزیرانی دەوڵەت پێی گوت: "وا چاکە دڵی پاشا ڕاگری و لەبەر دڵی ئەو بۆ چەند ڕۆژێکان بێیتە شاری و چۆنیەتی جێیەکە بزانی، دوایەش ئەگەر زانیتان ڕووناکاییتان لێڵییەکی لێ پەیدا بوو، ئەو کاتە بە ئارەزووی خۆتان بکەن.

وا ئەگێڕنەوە خواپەرستە هاتە شار، خانووی باغی تایبەتی پاشای بۆ ڕازاندرایەوە، جێیەکی دڵ وەکەر و ئارامبەخشی وەک بەهەشتی هاتە بەرچاو.

دوو تاکی

گوڵی سوور وەکو، ڕووی جوانانە
سونبولیش ئەڵێی، زولفی یارانە

بەڵام لە ترسی، سەرمای پیرێژن
گوڵ تێر شیر نەبوو، هەروەکو یێژن[1]

هۆنراو

(لەبان لقەکانەوە، گوڵنارە
ئاگر بەداری شینەوە، دیارە)

پاشا دەستبەجێ کەنیزەیەکی ڕوو وەک مانگی درەوشاوە جوانی بۆ هەنارد.

هەڵبەست

ئەم چەشنە مانگە، عابید ئەکا شێت
پەیکەری پەری و جوانی تاوس بێت
لەگەڵ دیتنی پەیکەری جوانیت
عابید خۆ ناگرێ و ئەکەوتە بەرپێت

---

١. یێژن = ئێژن: دەڵێن

هەر بەو جۆرە، پاش ئەمە، غولامێکی هەرزەکار و جوان و نەرمونیان و دەگمەنیشی بۆ بەرێ کرد.

پارچە

خەڵکی لە دەوری، لە تینوان خنکان
خۆشی ئاودێرە و هەر خۆیشی نایدات

چاو لە دیتنی، هەرگیز تێر نەبوو
وەک تینووی نەشکێ، لەناو زێی فورات

خواپەرست کەوتە خواردن و خواردنەوەی خۆش و لەبەرکردنی جلوبەرگی نەرمونۆڵ و گرانبەها و تام و چێژی میوەی شیرین و بۆن خۆشەوە و چاودانە جوانی غولام و کەنیزەکەوە و کەوتە خۆشییە.

ئاقڵمەندان گوتوویانە: "زولفی جوانان زنجیری پێی ئەقڵ و داوی مەلی زیرەکە".

خانە

لە ڕێگای عیشقی تۆ دامنا، دڵ و دین، دانش و سامان
منم ئیمڕۆ مەلی زیرەک، بەدوای تۆ گرفتارم

سەرەنجام دەوڵەتی کاتی خواپەرستەی کەوتە پەرێشانییە.

پارچە

کێیە لە فەقێ و شێخ و موریدان
بە هەناسەی پاک هاتە دنیاوە
کە دڵی دایە ئەم دنیای دوونە
وەکو مێش چەقییە، هەنگوین بەپاوە

جارێکی پاشا ئارەزووی سەردانی خواپەرستەی کرد، کە چووە لای دیتی ڕەنگ و ڕوو و دیمەنی جارانی گۆڕاوە و سوور و سپی هەڵگەڕاوە و قەڵەویی پێوە دیارە و پاڵی وە سەرینێکی دیباوە داوە و غولامێکی پەری پەیکەرینیش بە باوەشێنێکی

پەری تاوسێوە لەپشت سەریەوە ڕاوەستاوە.

بەسەلامەتی حاڵی دڵخۆش بوو و دانیشت، قسە و گفتوگۆی بۆ هەموو لایەکیەوە هێنا و برد تا لە دواییدا گوتی: "من لە جیهاندا ئەم دوو دەستەیە... کە دەستەی زانایان و خواپەرستانن بە دۆست و نزیکی خۆم ئەزانم"

وەزیرە فەیلەسووف و دنیادیتەکەی لەوێ بوو، گوتی: "مەرجی دۆستایەتی ئەوەیە کە لەگەڵ هەردوو دەستەکانیشدا چاکە بفەرمووی زێڕ بدەیە زانایان تا هەر بەدوای زانستی خۆیانەوە بن و هیچیش نەدەیە خواپەرستان تا واز لە خوا پەرستی نەهێنن.

خانە

بۆ شتێک لە دڵما، بمێنێ کەلێن
ناشێم بۆ ئەوەی، زاهیدم پێ بڵێن

پارچە

خاتوونی دیمەن جوان و ڕوو شیرین
خۆش نەدا لە تەل، دڵ ئەکا شەیدا

دەروێشی خاوەن، ڕەوشتی پیرۆز
لە هیچ جێ بە سواڵ، نان ناکا پەیدا

پارچە

ئەوەی ڕەوشتی جوانە و بۆ خوایە
بێ نانی وەقف و سواڵ زاهیدە

پەنجەی جوانان و بناگوێی دولبەران
بێ زێڕ جوانییان بۆ خۆی شاهیدە.

خانە

تا دنیـام هەبێ، زیاترم مـەبەسـتـە
گـەر بە زاهیـدم، نەژمـێرن ڕاسـتـە

٣٤- سەرگوزەشتە

ئەوەی تای ئەم وتە ڕاست دەکاتەوە ئەمەیە: دەگێڕنەوە پاشایەک کارێکی گرینگی هاتە پێش، گـوتی: "ئەگـەر ئەم کـارە بە ئارەزووی من ڕاسـت بێنێتـەوە، ئەوەندە درهەمە بەسەر خواپەرستاندا دەبەشمەوە".

کە نیـازەکـەی پێک هات و نارەحـەتی نەمـا، جێبـەجێکردنی پەیمانەکـەی بە پێـویست زانی، کـیسـە درهەمـێکی دایە دەست یەک لە نۆکـەرەکـانی تا بەسـەر خواپەرستانیدا ببەشێتەوە.

دەڵێن نۆکـەرەکـەی پیـاوێکی زیرەک و وشـیـار بوو، بە درێژاییی ڕۆژێ گـەڕا و ئێوارە گەڕایەوە و کیسە درهەمەکەی ماچ کرد و لە پێش پاشای دانایەوە و گوتی: "چەندلە دوای خـواپەرسـتـان گـەڕام وەچنگم نەکـەوتن". پاشـا گـوتـی: "ئەوە دەڵێی چی؟ هەر ئەوەی ئەمن بزانم چوارسـەد خـواپەرست هەر لـەم شـارەدا هەیە" وەڵامی دایەوە: "ئەی خـاوەنی زەوی! ئەوەی خواپەرسـتە زێڕ و پارە وەرناگرێ و ئەوەی زێڕ و پارەش وەردەگرێ خواپەرست نییە".

پاشـا پێ کـەنی و بە هاودەمـەکـانی گـوت: "من چەندم مـتـمـانە و باوەڕ بە خواپەرستان هـەیە، ئەم فێڵ و تەڵەکەبازە ئەمەندەیان دوژمن و ناحـەز و بێ باوەڕە پێیان، هەقیش بەوە، کە گوتوویانە:

خانە

زاهیـدێ وەرگـرێ، درهـەم و دینار
لەو زاهیـدتـرێ، بکە دۆست و یار

٣٥- سەرگوزەشتە

لە زانایەکی پایە بەرزیان پرسـی: لەبارەی نـانی وەقـفـەوە دەڵێی چی؟ گـوتی:

"ئەگەر بۆ دڵ ئاسوودەیی و ئارامکردنەوەی بیر و هۆش بێ حەڵاڵە و ئەگەر هەر تەنیا بۆ خواردنێ وەربگیرێ حەرامە"

خانە

خـاوەن دڵان نان، بۆ پەرسـتنێ دەبەنـە خـەڵوەت

نەک بچنە کونجی، خەڵوەت دانیشن لە بۆ لەتێ نان.

٣٦- سەرگوزەشتە

دەروێشـێک چووە جـێـیـەکی، خـاوەن جـێـیـەکـە دەست و دڵ واڵاو چاوتێـر بوو، دەسـتـەیەکی خـوێندەوار و ئەهلی ئەدەب لێ بوو، هەریەکـە قسـەیەکی خـۆش و دڵگەرەوەی ئەگێرایەوە، دەروێش لە بیابانەوە هاتبوو و هێشتا هیچی نەخواردبوو.

یەکێک لەوان بەگاڵتەوە پێی گوت: "تۆش دەبێ شتێک بڵێی".

دەروێشەکە گوتی: "من وەکو ئێوە راوێژ و زمانی پاراوم نییە و هیچیشم ئەزبەر نەکردووە. بە دێرە شیعرێک وازم لێ بێنن،

هەموو لە هەموو بە خۆشییەوە گوتیان: "بڵێ!" گوتی:

هۆنراو

منی برسی لە بەرامـــبـــەرمـــە، خــوانی نـان

وەک هەرزەکارێکم، لەبەر دەرگای گەرماوی ژنان

یاران لە دواییدا تێی گەیشتن و نانیـان لە پێش دانا، خانەخوێ گـوتی: "تاوێک راوەستە! وا کەنیزەکەکانم گۆشتت بۆ دەبرژێنن".

دەروێش سەری هەڵبڕی و گوتی:

خانە

مـەڵێ بوەسـتـە، بۆ گـۆشـتـی برژاو

نانی ڕووت گۆشتـە، بۆ برسیی دامـاو

٣٧- سەرگوزەشتە

مریدێک بە پیری خۆی گوت: چبکەم لە دەست ئەو خەڵکەی وە زاڵە هاتووم، هێندەم دێنە دیدەنیە کات و ساتم لێ تێکچووە"

پێی گوت: "ئەوەی هەزارە قەردی بدەیە و ئەوەی دەوڵەمەندیشە داوای شتێکیان لێ بکە، ئیدی نایەنەوە لات".

خانە

ئەگـەر ســواڵکەر، ســەرلەشکری ئیـســلام بوایە
ئەوا کافر لە ترسی سواڵ، ڕای دەکرد تا بەردەرگای چین

٣٨- سەرگوزەشتە

دانایەک بە باوکی گوت: "هیچ یەکێک لەو قسە دڵاوێز و ڕەنگینانەی پەندبێژان کارم تێ ناکەن، لەبەرئەوەی کە کردار و گوفتاریان وەکو یەک نییە و یەکتر ناگرنەوە"

دوو تاکی

خەڵکی فێر دەکەن، تەزکی دنیاکەن
بۆ خۆشیان پارە و دەغڵ و دان داکەن

زانایەک کە هەر، وتەی هەبێ و بەس
چی بڵێ قسەکەی، لێ وەرناگرێ کەس

زانا ئەوەیە، کــە خــراپە نەکـا
نەک بەخەڵک بڵێ و خۆی ئەوە نەکا

هەروەک قورئان ئەفەرمووێ: (أتأمرون الناس بالبر وتنسون أنفسكم)

واتە: فەرمان بە خەڵکی دەکەن بە چاکە و خۆشتان لە بیر دەچێتەوە.

## خانە

زانایەک هەر تەن پەروەری لە خــۆی بکا

ئەوە هەر خــۆی گـومـڕایە، ڕابەری کێ بکا؟

باوکە گوتی: "کوڕا من! هەروا لەخۆوە و بە خەیاڵی پووچی ڕووت ناکرێ ڕوو لە پەند و پەروەردەی، پەند و ئامۆژگاری بێـژان وەرگێڕی و گومـڕایی وەپاڵ زانایان بدەی و بەدوای زانایانی بێ گوناهدا گەڕانیش ئەبێتە مایەی بێبەشبوون لە کەڵک و قازانجی زانست و زانیاری، هەروەکو ئەو کوێرەی شەوێک کەوتبووە دەقن و قوڕ و چڵپاوێوە و هاواری ئەکرد، موسڵمانینە!! هەر نەبێ چرایەک لە ڕێگاکەمدا دانێن! ژنێکی قسە خۆش بیستی و گوتی: "تۆ کە چرا نابینی، بە چرا چ ئەبینی؟

هەروەها ئەنجوومەنی پەند و ئامۆژگارییان وەک دووکانی بازرگانان وایە، تا وشکە پارەیەک نەدەیت کووتاڵ وەرناگری، لەوێش هەتا ئارەزوو نەکەی خۆشی و شادمانی وەرناگری.

## پارچە

گــوێ لە بەندی زانا بگرە، بە دڵ و گــیــان

دڵ مــــەدە وتەی، پێــــچــــەوانەی کــــردار

ئەوە ڕاست نییە، کە ئەهلی لاف و گەزاف دەیڵێ

نووسـتوو چۆن نووسـتووی پێ ئەکرێ بێـدار؟

پیـــــاو دەبێ پەنـد، بگرێتـــــە گـــــوێ

گـەر پەند نووســرابێـتـەوەش، لەســەر دیوار

## پارچە

عـابیـدێک لە خـانەقـاوە، هاتە ناو مـەدرەسـە

پـەیمـانـی ئـاوەڵانـی، ئـەهـلـی تـەریـقـی شـکـان

پێم گوت: جیاوازی لە نێوان زانا و عابیدا چییە

ئەمــــــانەت بە باشـــــتـــــر دانا، لە ئەوان

گـوتی: "ئەمـانە بەری خـۆیان، لە ئاو دەردێن
هەوڵی ئەوان بۆ ڕزگـاری خنکاوە، لە خنکان.

٣٩- سەرگوزەشتە

یەکێکی مەست لەسەر چەقی ڕێیە نووستبوو، جڵەوی خۆی لە دەست دابوو، خوا پەرستێکی بەلادا تێپەڕی و لەو حاڵە قێزەونەی وردبووەوە، بەو مەستیەوە سەری بەرز کردەوە و پێی گوت: "إذ مروا باللغو مروا کراما" واتە - هەرکاتێک گوناهکارێکت دیت کاری خراپی کردووە بەڕێزەوە بەلایدا تێپەڕە.

هۆنراو

(کە گوناهکارت دیت، چاو پۆشە و بڕۆ
کـە پێت دزێوە، وەرە و پیـاو بە تۆ)

پارچە

ڕوو وەرگێڕە، عـابید لە گـوناهکار
بەچاوی بەخـشین، لەوی سـەیرکـە
گـەر من بە کـردار، ناجـەوانمەردم
تۆ وەک جـوانمەردان، لە من گـوزەرکە

٤٠- سەرگوزەشتە

دەستەیەک لە ڕەندان بۆ دەروێشێکی دەرپەڕین و هەرچی ناشایستەیە پێیان گوت و پێیان کرد. لە تاوان هانای بردە بەر پیری تەریقەت، کە حاڵێکی ئاوای بەسەرهاتووە، پیر پێی گوت:

"کوڕا من! خەرقەی دەروێشان کراسی ڕازیبوون و دڵنیاییە؟؟، هەر کەسێ لەم بەرگەدا بەرگەی نالەبارییان نەگرێ، نابێ ئەم بەرگە بپۆشێ.

خانە

دەریای پان و قـووڵ، بە بەرد لێڵ نابێ
دانا بڕەنجێ، هێـشـتـا تەنکاوە

## پارچە

گەر تووشی زیان بووی، خۆی بۆ ڕاگرە
کـە بە بووردنێک، لە گـوناە ئەبێ پاک

براکــە ئەنجـام، خــاکــە چارەنووس!
ببـە خـاک پێش وەی، ببیـەوە بە خـاک

## ٤١- سەرگوزەشتە

ئەم چیــرۆکــەیە، ببـیــە لە بەغـدا
لە ئـالاو پەردە، خــیــلافـێک ڕووی دا

ئـالا لە گـــەردی، ڕێ و ڕەنجی بەستن
گـــوتی بە پەردە، بە گلەیی کـــردن

من و تۆ هەر دووک، لە ئیش هاوکـارین
بەندەی بارەگـای، یەک فـەرمـاندارین

دەمـێک لە خـزمـەت، ئاسـوودە نیـمـە
وەخت و نـاوەخـــتـــان، لە ڕێڕەویمە

نـە ڕەنجت دیوە، نـە تاڵـی حـــەســـار
نە بیـابـان و ڕێ، نە گـەرد و غـوبار

من بۆ تێکۆشـان، پێم لە پێـشــتـرە
جـــا بۆچ نزیکیت، لە من زۆرترە؟

تۆ غــولامــانی، مــانگ ڕوو ئەبینی
لەگـەڵ کـیـژانی، بۆن یاسـەمـینی

منم کـەوتوومــە، دەسـتی شـاگـردان
پابەندی سـەفـەر، دایم سـەرگـەردان

گوتی: "من سەرم، لەسەر ئاستانە
نەک وەک تۆ، سەرم وا لە ئاسمانە

ئەوەی گەورەیی بوێ، بێ رێی خۆی
ئەکەوتە نزمی و دەرد و غەمی خۆی

"سەعدی" کەسێکە، پیرێکی کەوتوو
هیچ کەس نایەتە، شەڕی پەککەوتوو

٤٢- سەرگوزەشتە

یەکێک لە خواپەرست و پیاوچاکان، پیاوێکی پاڵەوان ئاسای رووگرژو دژ و مرچ و مۆنی دیت، کەفی لە زاری هەڵداوە، پرسی ئەمە چییە؟ پێیان گوت، فلانەکەس جنێوی پێداوە، وەلامی دایەوە: "ئەم بێ هونەرە، کێشی هەزار مەن بەرد هەڵ ئەگرێ و بەرگەی چاوپۆشینی قسەیەک ناگرێ."

پارچە

واز لەلافی هێز و مەردایەتی بێنە
ئەوەی خۆ نەگرێ زۆرکەمە، چ پیاو و چ ژن
گەر لە دەستت هات، دەمێ شیرین کە
پیاوەتی نییە مست دەی لە دەمێ، یانی بێدەنگ بن

پارچە

هەر کەسێ بێت و دەروەستی فیل بێ
پیاوەتی نەبێ، ئەوە پیاو نییە
ئادەمیزاد خۆی، هەویری خاکە
گەر خاکیی نەبێ، ئادەمی نییە

٤٣- سەرگوزەشتە

خوو و ڕەوشتی "اخوان الصفا"[1] یان لە گەورەیەک پرسی، گوتی:

ئەوانە هەمیشە حەز دەکەن ئارەزوو و بەرژەوەندییەکانی خەڵکی تر بخەنە پێش ئارەزوو و بەرژەوەندییەکانی خۆیانەوە، دانایان گوتوویانە: "ئەوەی هەر غەمی خۆیەتی و بەخۆیەوە خەریکە نە برادەرە و نە خوێش."

خانە

هاورێ ئەگەر پەلەی کرد، هاورێی تۆ نییە
دڵ مەدە بەو کەسەی، دڵ بەستەی تۆ نییە

خانە

کـەسێ خـۆی نەبینێ، ئایین و تەقـوا
دوورکـەویەوە لە، خـۆشـەویسـتی وا

لە یادمە یەکێک لە ناحەزان خراپەی لەم تاکە دێرە شیعرەی من گرتبوو، گوتبووی: "خوای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا نەفرەتی لە لێکتر دابڕان و فەرمانی بە خۆشەویستی لەگەڵ خزماندا کردووە و ئەوەی تۆش گوتت، پێچەوانە و دژی ئەمەیە".

گوتم: "ناماقووڵیت کرد، ئەوە بە گوێرەی قورئانە". (وإن جاهدك على أن تشرك بما ليس لك به علم فلا تطعهما) واتە:

"ئەگەر دایک و باوکت هەوڵیان لەگەڵ دای تا هاوتا و هاوبەش بۆ من دانێی، بەقسەیان مەکە".

خانە

هەزار خوێش کە بتکاتە بێگانە، لە خوا
فیدای بێگانەیەکی کە، بتکاتە ئاشنا

---

١. اخوان الصفا: برایانی دۆست پاک، کۆمەڵێکی نهێنی بوون، بە پەرتووک بڵاوکردنەوە کەسانیان وشیار ئەکردەوە.

٤٤- سەرگوزەشتە

پیرەمێردێکی ناسک، لە بەغدا
کیژۆڵەکەی خۆی، بە پینەچییەک دا

پیاوەی دڵ وەک بەرد گازێکی لێ دا
لە لێوی کیژە، هەر خوێن ئەتکا

سبەی کە باوکەی، کچەی بێ کەسی
دیت.. چووە لای زاوا، تا لێی بپرسی

ئەرێ هیچ و پووچ! ئەمە چ دگانە
تۆ لێوت گەزتووە، یانە هەنیانە؟

من لەم وتەیەم، گاڵتەم نییە مەبەس
گاڵتە لەلایەک، راستی بگرە دەس

کە خووی بەد جێی گرت، لەناو سروشتێ
قەت بەری نادا قیامەتیش هەستێ

٤٥- سەرگوزەشتە

واهاتووە کە زانایەک، کیژێکی تا بڵێی ناشیرینی هەبوو، کە باڵق بوو، لەگەڵ ئەو هەموو جیاز و بارگە و بنەشدا کە هەیبوو، کەس لای لێ نەدەکردەوە و نەیدەخواست.

خانە

ناشیرین دەبێ، ئاوریشم و دیبا
گەر لەبەری کا، بووکی نا زیبا

سەرەنجام بە ناچاری لە کوێرێکیان مارە کرد، وا دەگێڕنەوە کە لەو کاتەدا

پزیشکێکی چاوان لە "سـەرەندیب" ەوە هاتبـوو کـە چاوی کـوێر و نابینای روون ئەکردەوە، بە زانایەکەیان گوت:

"بۆ چاوی زاواکەت چاک ناکەیتـەوە؟" گوتی: "ئەترسێم هەر چاوی چاک ببێتـەوە کیژەکەم تەڵاق بدا و دەستی لێ هەڵگرێ".

نیو هۆنراو

مێردی ژنی ناشیـرین، کوێر بێ باشە.

٤٦- سەرگوزەشتە

پاشایەک بە چاوێکی سووکەوە ئەیڕوانیە خێڵی دەروێشان، یەکێکیان بە زیرەکی خۆی تێ گەیشت و گوتـی: "ئەی پاشا! ئێمـە بە سوپا و قۆشەن لە تۆ کەمترین و بەژیان لە تۆ بەختـەوەر و خـۆشـتـر و لە مـردنیـشـدا، وەکو یەک بەرابەرین و لە زیندووبوونەوە و هەستانەوەی قیامەتیشدا - خوابیکا - چاکترین"

دوو تاکی

گـەر خـاوەن مـوڵکی، ژیای کـامـەران
ئەگـــەر هەژاری، پێـــویســـتی بە نـان

بەو جـــۆرە هـەردوو، کـــە هاتنە مـــردن
چی ئەبەن لە ژیان، هـەر کـــــفن بردن

کـاتێ ئەجەل هـات، بارگەو بنەت بەست
گەدایی چاترە، نەک پاشـای سەرمەست

دیمەن و ڕواڵەتی دەرێشـانیش کۆنە کـراسـێکی پیناوی و سـەرێکی تاشـراوە و ڕاستییەکەی ناخیشیان، دڵێکی زیندوو و گیانێکی مردوویان هەیە"

پارچە

ئەو کەسەی دەرگا بە خەڵکی ئەگرێ
خۆی با ئەدات و هاتووە بۆ شەڕێ

دەبێ تێ بگا، یەکجار نەزانە
ئاقڵی دەکا، شەقی زەمانە

ڕێگای دەروێشان "یاد و سوپاس و خزمەت و ملکەچی و بەخشین و ڕازیبوون بە بەش و یەکتایی ناسین و پشت قایمی و خۆ بەدەستەوەدان و بەرگەگرتنە". هەر کەسێکی ئەم ئاکارانەی لێ وەدەرکەوێ بە ڕاستی دەروێشە با کراسی بە نرخیشی لەبەردابێ، یا لە ناو کراسی بەنرخدا بێ.

بەڵام هەرزەگۆ و نوێژنەکەر و ئارەزوو پەرست و هەوەس باز ئەگەر ڕۆژیش بگەیەنێتە شەو و شەو لە خۆشی ڕابواردندا بکاتەوە ڕۆژ لە خەوی غەفڵەتا و هەرچی هاتە پێشی بیخوا و هەرچی هاتە سەر زمانی بیڵێ ئەوە بێ ئاینە، خۆ ئەگەر لە عەبای لۆکەشدا بێ.

ئەی دەروون بەتاڵ لە تەقوای خودا
جامەی ڕیاییت، کردۆتە بەرت
پەردەی حەوت ڕەنگیت بە بەر دەرگاوە

لە ژووریش حەسیر، بۆتە ڕاخەرت

دوو تاکی

چەند گوڵێکم دیت، کرابوونە دەستە
لەسەر گومبەزێک، بە گیا بەربەستە
گوتم: "چۆن دەبێ، گیای ناچیز، وا
لە ڕیزەی گوڵێ، دانیشێ هەر وا

گیا گریا و ویستی، بێدەنگ بم خامۆش
ناشێ یارانم، بکەم فـــەرامـــۆش

گـەر نیشـمـە بۆن و ڕەنگ و جـوانی
ئەی هەر گیای ئەو نیم، لە باغەکانی؟

هەر منم بەندەی، یەزدانی کـــەریم
پەروەردەی چاکە و نیـعـمـەتی قـەدیم

گـەر بێ هونەرم، ئەگـەر هونەرمـەند
ئومـێـد ئاورێکە، لەلای خـوداوەند

سـەرەرای ئەوەش، خـاوەن کووتاڵ نیم
خاوەن سـەرمایەی، تاعەت و مـاڵ نیم

خـۆی چارەی کـاری، بەندە ئەزانێ
کـە دەستی بەربوو، لە گشت دامـانێ

ئەوە دابێکە، خـــاوەنی مـــوڵکان
ئەپۆشن لە ئاست، بەندەی پیـر چاوان

خـودای من! کـە تۆ جـوانی جـیـهـانی
ببـەخـشـە بەندەی، پیـر و زورهـانی

"سـەعدی" بگرە ڕێی، قـیـبلەکـەی ڕەزا
ئەی مـەردی خـودا، بگرە ڕێی خـودا

بەدبـەخت ئەوەیـە، وەربـگێــــڕێ ڕوو
هیچ دەرگـای دیکە، نییـە لە پێش توو

٤٧- سەرگوزەشتە

لە دانایەکیان پرسی: "ئازایەتی و دڵاوایی (سـەخـاوەت) کامیـان باشـترن" گوتی: "ئەوەی دڵاوایە پێویستی بە ئازایەتی نییە".

## پارچە

نووسراوە لەسەر، گۆڕی بەهرام گۆر
دڵت والا بێ، نەک بازووی بە زۆر
کە جیهانمان گرت، بەهێز و مەردی
هیچمان لەگەڵ خۆ، نەبردە ناو گۆڕ

## پارچە

نەماوە حاتەمی تایی، بەڵام هەمیشە
ئەمێنێ ناوی بڵندی و بە چاکە ناو ئەبرێ
زەکاتی ماڵ بدە، لقی بێ کەڵکی دارمێوان
تا باغەوان ئەیبڕێ، ئەو زیاتر ئەدا ترێ

دەرگەی سێیەم

# لەبارەی قنیات "قەناعەت" و دڵنیابوون بە بەش

١- سەرگوزەشتە

سواڵکەرێکی مەغریبی لە کووچەی بازاڕێکی شاری (حەڵەب) ێدا ئەیگوت: "ئەی خاوەن ماڵ و سامان و داراییەکان! ئەگەر ئێوە ویژدان و ئینسافتان هەبووایە و ئێمەش قیناتمان بە بەشی خۆمان هەبووایە، دیاردەی سواڵکردنێ لە هەموو دنیایەدا نەدەما".

پارچە

ئەی قەناعەت تۆ، دەوڵەمەندم کە

لە تۆ بەو لاوە، کوا خێرو خۆشی

کونج گرتنی سەبر، لوقمان دایناوە

کە سەبرت نەبێ، بێ هۆش و گۆشی

٢- سەرگوزەشتە

دوو ئەمیرزادە، لە میسرێ هەبوون، یەکێکیان ئەیخوێند وَ زانست فێر ئەبوو، ئەوەی تریان، سامان و دارایی پێکەوە دەنا و پاشەکەوتی ئەکرد، ئەو بووە زانای رۆژ و ئەمەشیان بووە "عەزیزی میسر" ێ، پاشان دەوڵەمەندەکە بە چاوێکی سووک سەیری زانایەکەی ئەکرد و گوتی: "ئەوەتا من گەیشتمە پاشایەتی و تۆش هەروا لە دەستکورتیدا ماویەوە". وەڵامی دایەوە:

"براله! دەبێ من هەر سوپاسی چاکەی یەزدانی بەرز و مەزن بکەم کە میراتی پێغەمبەران - زانین - م بۆ ماوەتەوە و تۆش میراتی فیرعەون و هامان- فەرمانڕەوایەتی میسر".

دوو تاکی

من ئەو مێرووەمە، پێم پیا ئەماڵن
زەردەواڵە نیم، لە چزووم بناڵن

سوپاسی ئەمە، چۆن بهێنمە جێ
کە هێزی وەم[1] نییە، کەس لێم برەنجێ

٣- سەرگوزەشتە

دەروێشێکم دیت، لە ئاگری هەژاریدا ئەسووتا و پینەی لەسەر پینەی خەرقەکەی ئەدا و بۆ سرەوتی دڵی خۆی ئەدوا.

خانە

بەنانی وشک و بەرگی دەروێشی
بژی، نەک نازی هیچ کەس بکێشی

یەکێک پێی گوت: "ئەوە بۆ وا دانیشتووی و چاوەڕێی چیت؟ کە فلان لەم شارەدا دڵێکی چاک و والای هەیە و چاکە و بەخششی بۆ گشتە، چاکی خزمەتی ئازادانی کردووە بەلادا و بە هەموو دڵێکەوە هاتووە، ئەگەر چۆنیەتی گوزەرانی تۆش ئاوا وەک هەی، بزانێت، ئەوەی پێویست بێ، بە گوێرەی دڵی تۆی دەکا و بۆ تۆش بەهەل دەزانێ"، گوتی: "بێ دەنگ بە! لە هەژاری و دەستکورتییەدا لە برسان مردن باشترە، نەک لەبەر کەسێک دەستی دەرۆزە پان کەیتەوە".

پارچە

گۆشەنشینی و کراس پینەکردن
چاترە لە داوای، کراس لە گەوران
راست وەکو یەکە، سزای ناو دۆزەخ
بۆوەی چووە بەهەشت، لەسایەی جیران

---

١. وەم: ئەوەم.

٤- سەرگوزەشتە

یەکێک لە پاشایانی عەجەم، پزیشکێکی زانای کارامە و تێگەیشتووی ناردە خزمەت "پێغەمبەر" - دروودی خوای لێ بێ - ساڵێک لە وڵاتی عارەباندا مایەوە، هەر بۆ تاقیکردنەوە، یەکێکی نەهاتە لا و داوای چارەسەرییەکی نەکرد.

ڕۆژێک پزیشکەکە هاتە لای پێغەمبەر - دروودی خوای لێ بێ - و گلەیی کرد و گوتی: "منیان بۆ چارەسەرکردنی هاوەڵان ناردووە و کەچی لەم هەموو ماوەیەدا کەسێکم بەلاوە نەهاتووە، تا ئەو خزمەتەی کە پێم سپێردراوە بە جێی بێنم".

"خۆشەویست - د. خ - فەرمووی: "کە ئەمانە تیرمیەکن هەتا برسییەتی تەنگاویان نەکات، هیچ ناخۆن، ئارەزووی خواردنیشیان هەر دەمێنێ کە دەست هەڵ ئەگرن".

پزیشک گوتی: "هۆی لەشساغییان ئەمەیە" خاکی بەردەمی ماچ کرد و ڕۆیشت.

دوو تاکی

پزیشک کاتێ، کە دێتە گوتار
بە نەخۆش ئەڵی، خواردن مەخە زار

لە بێ دەنگییا، ڕوو بدا زیان
لە برسییەتیدا، با بدا گیان

ئەوکاتە ڕاستە، ئامۆژگاری کا
خواردن هێندەبێ، گیان ڕزگاری کا

٥- سەرگوزەشتە

لە ڕەوشتی ئەردەشێری بابەکانەوە هاتووە، کە لە پزیشکێکی عەرەبی پرسی: "کە خواردن ڕۆژێ چەند دەبێ بخورێ؟"

گوتی: "کێشی سەد درهەم بەسە".

وەڵامی دایەوە: "ئەمەندە چ هێزو تینێک ئەدا؟"

پزیشک گوتی: "ئەمەندە هەڵت ئەگرێ، لەمە زیاتر بێ تۆ هەڵی ئەگری".

خانه

خـــواردن بۆ ژین و زیکر کـــردنه
نەک وا تێـبگەی، ژین بۆ خـواردنه

٦- سەرگوزەشتە

دوو دەروێشی خـوراسـانی ئەگـەڕان، یەکـێکیـان لاواز و ڕۆژوودار بوو بە دوو شــەو ژەمێکی ئەخوارد. ئەوەی تریان قەڵەو و بەتین و تاقەت بوو، ڕۆژێ سێ ژەمی دەخوارد.

وا ڕێکەوت لە دەرگـای شـارێک، بە تاوانی جـاسـووسـیـیـەوە گـیـران و هەردووکیـان پێکەوە خرانە زیندانێوە و دەرگای زیندانەکەشیان قوڕ دادا و لەسەریان قەپات کردن.

دوای دوو هـەفـتـە وەدەرکـەوت کـە بـێ گـوناهن، دەرگـاکـەیان لـەسـەر کـردنەوە، دیتـیـان، قـەڵـەوە بەتین و تاقـەتەکـە مردووە و لـەڕ و لاوازەکـەش گـیـانی بە سـاغی دەرکردووە، لەمەدا ئەوق مان یەک لە دانایان گوتی:

"ئەگەر بە پێچەوانەی ئەمەوە بووایە جێگای واق وڕمان بوو، لەبەر ئەمەی ئەوە زۆر خۆر بوو بەرگەی برسییەتی نەگرت و لە دژواریدا مرد، ئەمەی تریان خۆگر بوو، هەروەکو ڕەوشتی خۆی، بە ئارام بوو و بە ساغی مایەوە.

پارچە

کە کەم خواردنی، بووە خووی کەسێک
هەمـوو سـەخـتـیـیـەک، ئاسـان ئەبڕێ
تەنپـەروەرێکیش، کە فـێرە خـۆشـیـیە
بەتـەنگاوییـەک، بەرناگـرێ و ئەمـرێ

خانه

تـەنووری زگت، دەم بـە دەم داخـــەی
بەلای ئەو ڕۆژە، وەسـەر خۆت ناخـەی

٧- سەرگوزەشتە

یەک لە دانایان کوڕەکەی خۆی لە زۆر خواردنێ ئەترساند، کە پیاو بە زۆر خواردن و چڵێسی تووشی ئازار و نەخۆشییان دەبێت، گوتی: "باوکە برسییەتی پیاو دەکوژێ، ئەی نەتبیستووە کە خۆش گوفتاران گوتوویانە، کە بە چڵێسی مردن باشترە لە گیان بە برسییەتی ئەسپاردن؟"

باوکەکە گوتی: "ئەوەندەش ئاگادار بە کە (کلوا واشربوا ولاتسرفوا)

واتە - بخۆن و بخۆنەوە و زێدەڕۆییەش مەکەن و لە ئەندازە مەچنە دەرێ"

خانە

نەهێندەی بخۆ، لە زارت دەرچێ

نە واش بەڕێوە، گیانت دەرچێ

پارچە

هەر کەسە و بای خۆی، با خواردن بخوا

زێدەڕۆیی کا، ئەکەوتە[1] ئازار

گەر گەزۆ بەزۆر، بخۆی زیانە

بە درەنگەوە نان، گەزۆیە ئاودار

٨- سەرگوزەشتە

بە دەردەدارێکیان گوت: "حەزت لە چییە؟" گوتی:

"ئەوەی بۆ دڵم زەرەرە".

خانە

زگ کە بە خواردن پڕکرا، ئەبێتە هۆی ئازار

دەرمان بێ سوودە، لەش ساغ ناکاتەوە یەک جار

---

١. ئەکەوتە: ئەکەوێتە

٩- سەرگوزەشتە

لە شاری (واسیت) بەقاڵێک چەند درهەمێکی کەوتبووە لای سۆفییان، هەموو ڕۆژێ داوای پارەکەی لێ دەکردنەوە و قسەی ڕەق و ناخۆشیشی پێ دەگوتن. برادەران لە قسەکانی وە زاڵە هاتبوون و دڵشکاو بوون و خۆڕاگرتن نەبێ هیچی تریان لە دەست نەدەهات و لەوە زیاتر چارەی تریان نەبوو.

یەکێک لە پیاوەکان ئەمەی بیستەوە، پێ کەنی و گوتی: "پەیمانی خواردن بەخۆدان هاسانترە، لە بەڵێندان بە بەقاڵ بۆ درهەم".

پارچە

لە چاکەی گەوران، تا دووربی باشە
نەک لە پاشاندا، ببی پەشیمان
لەتاو پاروویک گۆشت، بمری چاترە
لە دیتنی چارەی، بەدی قەسابان

١٠- سەرگوزەشتە

پاڵەوانێک لە جەنگی تاتاراندا برینێکی گەورەی تێ بوو، یەکێک پێی گوت: فلانە بازرگان دەرمانێکی زۆر چاکی هەیە، ئەگەر بچیە لای لەوانەیە هەندێکت بداتێ و ئەڵێن ئەو بازرگانەش ئەوەندەی حاتەمی تایی کە بە دڵوالایی و سەخاوەتەوە بەناوبانگ بوو، ئەویش هێندە بە قرچۆکی.

خانە

گەر لەسەر خوانی لە جێی نان، هەڵ بهاتایە هەتاو
تاقیامەت رۆژی ڕووناک، نەی ئەدی هیچ کەس بە چاو

پاڵەوانەکە گوتی: "بیدا یا نەی دا، دەرمانی ویم ناوێ، چونکە ئەگەر بیدا یا سوودی هەیە یا نییەتی، هەر داواکردنەکە لەو بۆ خۆی مردنێکە و بەس.

خانە

زیاتر لە دوو نان، بە منەت بخوازی
پێی قەڵەو دەبی و بەگیان لاوازی

دانایان گوتوویانە: "ئەگەر گریمان ئاوی حەیاتێ بە ئاوی ڕووان بفرۆشن، دانا نایکڕێ، مردنی بە دەردەداری باشترە لە ژیانی بە سەنگەساری".

خانە

ئەگەر گووژاڵک بخۆی بەدەستی، کەسێکی خۆش ڕوو
سەد جار چاکترە لە شیرینییەک، بە دەست ترش ڕوو

١١- سەرگوزەشتە

یەکێک لە زانایان خێزانێکی زۆر و دەرامەتێکی کەمی هەبوو - بە یەکێکی لەو گەورانەی کە متمانەیەکی زۆری پێی بوو، گوزەرانی خۆی پێ گوت، کابرا ڕووی لە داوایەکەی وەرگێڕا و خۆی گرژ کرد و سواڵکردنی زانایانی لە دڵان گران هات.

پارچە

مەچووە لای کەسێ، قەت بە ڕووگرژی
چوون لێی تاڵ دەکەی، خۆشیی ژیانی
بە ڕووی خۆشەوە، دەم بە پێکەنین بچۆ بۆ ئیشێ
هەر تەنیا ڕووخۆش، جێبەجێ دەکرێ پێویستییەکانی

دەگێڕنەوە، مووچەکەی دوو ئەوەندە بۆ زیاد کرد و زۆریشی لەمتمانە و دیدەنییەی کەم کردەوە، پاش چەند ڕۆژێکان سەیری کرد لوتف و خۆشەویستییەکەی جارانی نەماوە گوتی:

خانە

(خواردنێک ملکەچی، بیهێنێتە دەست
مەنجەڵ پڕ ئەبێ، ڕێزیش نزم و پەست)

خانه

نـانم زیـاد بـوو، ئـاوی ڕووانم چـوو
هـەژاری چـاتـره، لـه چـوونـی ئـابـڕوو

١٢- سەرگەوزەشتە

دەروێشێک پێویستییەکی هاته پێش، یەکێک پێی گوت: "فڵانەکەس سامان و دارایییەکی بێ ئەندازەی هەیە، ئەگەر بە گرفت و پێویستی تۆ بزانێ، دەستبەجێ بۆت جێبەجێ دەکات. وەڵامی دایەوە: "نایناسم". پێی گوت: "من چاوساغییەت دەکەم"

دەستی گرت و بردیەوە ماڵی ئەو کەسەی.

دەروێشەکە، یەکێکی لچ شـۆڕ و نێوچەوان گرژ و مۆن و ڕووترشی دیت دانیشتووە، گەڕایەوە و هیچی پێ نەگوت. یەکێک لێی پرسی: "چیت گوت و چیت کرد؟ وەڵامی دایەوە: "بەخششەکەیم بە چارەی خۆی بەخشییەوە"

پارچە

گـرفـتـت مـەبە، بەردەم پیـاوی مـۆن
لەبەر نـاحـەزیەی، ئەکـەویە ئازار
گـرێی دڵی خـۆت، بەکـەسـێک بڵێ
سـەر و ڕوو خۆش بێ و بزە لەسەر زار

١٣- سەرگوزەشتە

ساڵێکیان وا ڕێککەوت، لە "ئەسکەندەرییە"دا گرانییەکی وا داکەوت مەپرسە، بەجۆرێک جڵەوی خۆ لەبەر ڕاگرتنێی دەروێشان لە دەست دەرچوو و دەرگایەکانی ئاسمانێ بە ڕووی زەویدا داخران و هاواری دانیشتوانی سەرعەردی بەرەو ڕووی خوای ئاسمانان بەرز بووەوە.

پارچە

نەماوە جانەوەری کێوی و مەل و ماسی و مێروو
نەگەیبێتە ئاسمان، هات و هاوار و گریانی

سەیرە کە دووکەڵی هەناسەی خەڵکی، چەم نابێ
تا ببێتە هەورو فرمێسکی چاوەکانیش بارانی

هەر لەو ساڵەدا لووسکەیەک "پەرژین بێ" کە هەر باسکردنی لادانە لە رەوشتی ئەدەب و وێڵ، بە تایبەتیش لە خزمەتی گەورە پیاواندا و واز لێ هێنانیشی ناکرێ چونکە بەلای هەندێکانەوە بێ دەسەڵاتییە، بۆیە هەر بەم دوو خانانە وازم هێنا.

پارچە

ئەگەر تاتارێک، لووسکەیەک بکوژێ
تاتارێک نادرێ لە تۆڵە، بە کوشت
تاکەی هەر ئاوا، وەک پردی بەغدا
ئاوی بە ژێرا و خەڵکی لەسەر پشت

"کەمێک نیشانەی زۆریە و مشتێکیش نموونەی خەروارێک" یەکێکی وا، کە شتێکت لەبارەیەوە بیست، لەو ساڵەدا ماڵ و سامانێکی زۆری هەبوو و زێڕ و زیوی بەسەر هەژاراند دەبەشییەوە و سفرەی بۆ رێبواران راخستبوو.
کۆمەڵە دەروێشێک لەبەر ئازاری هەژاری و نەدارییە هاتبوونە گیاندان و مردنێ - باسی سفرە و خوانی ئەویان کردەوە و پرسیان پێ کردم، سەرم لە بڕیارەکەیان بادایەوە و گوتم:

پارچە

هیچ کاتێ ناخوا، شێر بەرماوەی سەگ
لە برسا بمرێ، لە چیا و بەندەنێ

با لەرو لاواز، با هەر برسی بێ
مەچۆ لای سپڵە، نانێکت دەنێ

گـەر بەڕێ و جێ، فـەرمیدوونێک بێت
بێ هونەر لەگەڵ، هیچ کـەس دامـەنێ

دیبـا و ئاوریشـم، لەبەر ناکــەســان
وایـە، زێـڕ و زیـو، بـە دیـواروە[1] نـێ

١٤- سەرگوزەشتە

بە حـاتەمی تاییـان گـوت: "کەست لە خۆت بەهیمـمـەت گەورەتر دیوە لە دنیـایەدا؟"
گوتـی: "بەڵێ! ڕۆژێکیان چل حوشـتـرم بۆ میـوانان سەر بڕیبـوو، سەران و گـەورە - پیـاوانـی عـارەبانم بانگ کـردبوون، لە پڕ بۆ کـارێکی چـوومـە لایەکی بیـابانێ، دڕک (زی) کـێـشـێـکم دیت کـۆڵێکی دڕکـەزی کـۆ کـردبووەوە، پێم گـوت، بۆ نـاچیـیـە میوانداریی‌یەتییە حاتەمی؟

ئەوڕۆ زۆر لە میوانان لەسەر سفرەی وی کۆ بوونەتەوە"

گوتی:

خانە

هەر کـەسێ، ئیـشی خـۆی بخـوا
هەرگــیـز منەتی، حــاتەمی نـابا

من ئەوم بەهیمـمەتتر و بەرچاو تێرتر دیت لە خۆم.

١٥- سەرگوزەشتە

ئەعـرابیــیـەکم لە گــوزەری گــەوهەر فــرۆشـــانـی شــاری "بەســرا" یـەدا دیت، سەرگوزەشتەی خۆی ئەگێڕایەوە، گوتی:

"جـارێکیـان لە بیـابانێدا ڕێم ون کـردبوو، نـانم پێ نەمـابوو، خـۆم دایە دەست مردن، کتوپڕ کیسەیەکی پڕ لە مرواریم دۆزییەوە هەرگیز ئەو خۆشی و شـادییە لە بیـر نـاکـەم کـە وام زانی برێشکەی گـەنمە، هەروەهـا ئەو تاڵی و نائومـێـدییـەش لە بیرناکەم کە زانیم مروارییە.

---

١. بە دیواروە: بەدیوارییەوە.

پارچە

له بیـــابانی وشک، له ملی بێ پایان
تینوو له زاریا، دور بێ یا ســـەدەف
مـرۆی بێ خـۆراک، کـە لە پێ کـەوت
له کـەمـەر بەندیا، زێڕ بێ یا خـەزەف[1]

١٦- سەرگوزەشتە

"مـووسـا" - سـلاوی خـوای لێ بی - دەروێشـێکی دیت لە ڕووتیـیـان خـۆی لە ملی گرتبوو، گوتی "مووسا"! دوعام بۆ بکە خوا بایی ژیانی خۆمم بداتێ، "مووسا" بۆی پاڕایەوە و ڕۆیشت، پاش ماوەیەک "مووسا" دەروێشەی دیتەوە گرتوویانە و خەڵکی لێ کـۆبـوونەوە، مـووسـا پرسی: "ئەوە چیـیـەتی؟" پێـیـان گـوت: "ئەوە مـەی خـواردووەتەوە و هەرزەییی کردووە و یەکێکیشی کوشتـووە و، ئێستـاش ئەوە بۆ تۆڵە لێ سەندنەوە و سزادانێیان هێناوە.

هۆنراو

پشـیلەی هـەژار، گەر هـەیبـووایە باڵ
چوێلەکـەی دنیـای، ئەکـرد پایەمـاڵ

هۆنراو

بێ دەست کـە دەسـتی، هێـزی پەیداکـرد
هەڵ ئەسـتێ دەسـتی، بێ دەست ئەکـا ورد

"مـووسـا" - سـلاوی خـوای لێ بێ - دگـانی بە حـیکمـەتی خـوادا نا و داوای لێبووردن و لێ خۆشـبوونی لەو بوێرییەی خۆی کرد، خـوای گەورە فەرموویەتی (ولو بسط الله الرزق لعـبـاده لبـغـوا في الارض) واتە: ئەگـەر خـوا ڕۆزی و بژێوی بۆ بەندەکانی خۆی هەڵ ڕێژێ، لەسەر زەوی دەست دەکەن بە خراپەکارییە.

---

١. خەزەف: شیشۆق

هۆنراو

چی ترساندیتی، ئەی لەخۆبایی لەو تەڵەزگەیە
هەتا لە ناوچووی، خۆزگە نەئەفڕی هیچ مێروولەیە

هەڵبەست

ناکەس کە هەیبوو، پایە و زێڕ و زیو
دەبێ زللەیەک، بەسەریا ماڵی
ئەی نەتبیستووە، دانایەک چی گوت؟
مێروو وا باشە، هەر بە بێ باڵی

دانا

باوک هەنگوینی زۆرە، بەڵام کوڕ (تا) یەتی.

خانە

ئەوەی ناتکاتە خاوەن سامانی
سوودی تۆ لە خۆت، چاتر ئەزانی

١٧- سەرگوزەشتە

عارەبێک لە بیاباندا لە کاتێکی هەرە تینووەتییەیدا ئەیگوت:

هۆنراو

(خۆزگە لە پێش مردنما، ڕۆژێ ئەگەیمە ئاوات
رووبار دابای لە چۆکم و پڕم کردبا، گۆزەوات

هەروەها لە بیابانی پانوپۆڕ و هەراودا ڕێبوارێک ڕێ ون دەکا و هێز و توانای لێ دەبڕێ، چەند درهەمێکی لە تەکبەندیدا دەبێ، گەڵێک ئەملاو لا دەکا سەر لە ڕێگا دەرناکا و لە تینوواندا دەمرێ، هەندێ کەسی بەلادا تێ ئەپەڕێ، درهەمەکانی دەبینن لەبەردەمیدا دانراون و لەسەر زەوییەکەش نووسراوە.

پارچە

گەر هەبێ هەموو، زێڕی جەعفەری
پیاوی بێ توێشە، قەت نابینێ کام

لە بیابانەدا بۆ، برسی و هەژارێ
شێلمی کوڵاو چاترە، لە سەد زیوی خام

١٨- سەرگوزەشتە

هەرگیز لەبەر جەوری زەمانەم نەناڵاندووە و لە سووڕی دەورانم ڕوو گرژ نەکردووە، ئەو کاتە نەبێ کە پێ خواست بووم و توانای پەیداکردنی پاپۆشێکم نەبوو. بە دڵتەنگییەوە چوومە مزگەوتی "کووفە" پیاوێکم دیت هەردوو پێی نییە. زۆر سوپاسی بەخششی یەزدانی مەزنم کرد و لەبەر بێ پێڵاوییەش ددانم بەخۆمدا گرت.

پارچە

مامری بریانی، لەبەر چاوی تێر
لە گەڵای درەخت، کەمترە لەسەرخوان

ئەوەی دەست کورتە و بێ توانایە
شێلمی لێ دەبێتە، مریشکی بریان

١٩- سەرگوزەشتە

یەکێک لە پاشایان لەگەڵ چەند دەست و پێوەندێکی خۆی، لە ڕاوێ و بە چلەی زستانێ و دوور لە شاری، شەویان بەسەردا هات، لە دوورەوە ماڵە لادێییەکیان چاو کرد، پاشا گوتی: "با ئەم شەو لەلای ئەو ماڵە بەسەر ببەین، تا سەرمامان نەبێت" یەکێک لە وەزیرەکان گوتی: " پەنابردنە بەر ماڵی لادێییەکی کەم لە پلە و پایەی بڵندی پاشا ناوەشێتەوە، هەر لێرە چادر هەڵدەدەین و ئاگر دەکەینەوە.

لادێییەکە پێی زانی، بەوەی هەیانبوو، چێشتێکی ئامادە کرد و لەپێش پاشای دانا و خاکی بەرپێی ماچ کرد و گوتی: "پلە و پایەی پاشا بە دابەزینی لە ماڵی

لادێییەک نزم نەدەبووەوە، بەڵام نەیانویست پایەی لادێییەکە بەرز بێتەوە".

پاشا قسەکەی لێ خۆش هات، هەر بەو شەوە چوو لە ماڵە ویدا دابەزی، زۆر بە خۆشییەوە لادێییەکە ئەو شەوە لە خزمەتیدا بوو. بەیانی پاشا خەڵات و بەراتێکی چاکی کرد.

بیستم لادێییەکە ماوەیەک دەست بە ڕکێفی پاشاوە دەڕۆیی و دەیگوت:

پارچە

شـــان و شکۆهـی سـوڵتـان، هیـچی لێ کـەم نـەبۆوە
کـە لە مـاڵی جـووتیـارێک، دابـەزی بوو بـەمـیـوان

گـۆشـەی کـڵاوی جـووتیـار، ئەگـاتە ئاسـمـانێ
کە خۆی خستە ژێر سایەی، یەکێکی وەک تۆی سوڵتان

٢٠- سەرگوزەشتە

ئەگێڕنەوە، سواڵکەرێک ماڵێکی زۆری پاشەکەوت کردبوو، یەکێک لە پاشایان پێی گوت: "وادیارە ماڵێکی زۆرت هەیە، بە بەشێک لەو ماڵە بۆ گرفتێکی کە هاتووەتە پێشێ دەستم بگرەوە، کە گرفتەکەش تێپەڕی و نەما، ماڵەکەت ئەدرێتەوە.

سواڵکەر وەڵامی دایەوە: "ئەی گەورەی سەر رووی زەوی! لە پایەی بەرزی ئێوە ناوەشێتەوە دەستتان بە ماڵی یەکێکی وەک منەوە گڵاو (ئاوەگڵ) بکەن، کە دانە دانە بە سواڵکردنێم کۆ کردووەتەوە" پاشا وەڵامی دایەوە "گوێ مەدە ئەمە، ئەیدەمە تاتاران "الخبیثات للخبیثین" واتا: شتی چەپەڵ بۆ چەپەڵان.

هۆنراو

(گـوتیـان پاک نـیـیـە، گـەچی گـیـراوە
گوتمان پێی دەگرین، کونی ئاودەستێ)

خانه

گەر ئاوی بیری، گاوریش پاک نەبێ
جووی[1] پێ ئەشۆرین لەمەت باک نەبێ

بیستم کە گوێی نەدایە فەرمانی پاشا، زۆر بیانووی هێنانەوە، پاشا فەرمووی، بەهەڕەشەو سزاوە چی هەبوو لەوەی گوتبووی لێیان ئەستاند.

دوو تاکی

بەنەرمی و خۆشی، کە پێک نەهات کار
سەرت بۆ کوتەک، نزم کە ناچار

کێ بە خۆشی خۆی، ماڵی نەبەخشی
یەکێ تر ئەیبا، بۆ کەیف و خۆشی

٢١- سەرگوزەشتە

بازرگانێکم دیت باری چل حوشتر کوتاڵ و چل بەندەی خزمەتکاری هەبوو، شەوێ لە دوورگەی "کیش"[2] منی بردە ژوورەکەی خۆیەوە و بە درێژاییی شەوێ لە قسەی پەرت و بڵاو و بێ سەر و بەر نەکەوت.

کە بەڵێ فڵانە هاوبەشم لە تورکستانە و هێندە کوتاڵەم لە هیندستانە و ئەمە تاپۆی فڵانە زەوییە و فیسارە کەس پەیدانی[3] فڵان ماڵە.

جارێک ئەیگوت، ئارەزووی چوونی ئەسکەندەرییە ئەکەم، هەواکەی خۆشە، دووبارە ئەیگوت: "نا، نا! زەریای رۆژئاوا پەشێوە.

سەعدیا! سەفەرێکی ترم لە پێشە بمکردبایە، ئیتر ئەوەندە تەمەنەی ماوەمە لە کونجێکی دادەنیشتم، گوتم:

---

١. جوو: جوولەکە.
٢. کیش: دوورگەیەکە لە کەنداوی فارسدا.
٣. پەیدان: ضامن: کەفیل.

"ئەو سەفەرە کامەیە؟" گوتی: "ئەمەوێ گۆگردی فارسی ببەم بۆ چین دەڵێن نرخێکی باش دەکا و لەوێوە کاسەی چینی بۆ ڕۆم و دیبای ڕۆمی بۆ هیند و پۆلای هیندی بۆ "حەڵەب" و ئاوێنەی حەڵەبی بۆ یەمەن و کراسی یەمەنی، بۆ فارس ئەبەم، دوای ئەمە واز لە سەفەر ئەهێنم، بۆ خۆم لەسەر دووکانێ دادەنیشم".

زۆری لەو خولیایانەوە گوت، کە ئیدی توانای گوێگرتن نەما، گوتی: "هۆ سەعدی! تۆش قسەیەک لەبارەی ئەو شتانەوەی دیتووتن و بیستووتن بکە! گوتم:

هەڵبەست

بیستووتە ڕۆژێ، کە بازرگانێ

لە وڵاغ بەربۆوە، کەوتە ئەو گۆڕە

گوتی چاوتەنگی، پیاوی دنیادار

پڕ ئەبێتەوە، بەقنیات یاخۆ خاکی ئەم گۆڕە

٢٢- سەرگوزەشتە

بیستم ساماندارێک، ناوبانگی قرچۆکییەی وەکو ناوبانگی چاوتێریی حاتەمی تایی بڵاو بووبووەوە و ناوی دەرکردبوو، ئەو ڕژدی و قرچۆکییەشی وا لە ناخیدا چەقیبوو بەئەندازەیەک نانێکی بە گیانێک نەئەدا و پشیلەی "ئەبو هورەیرە"ی بە پاروێک نەئەلاواندەوە و هێسکێکی فڕێ نەئەدایە بەردەمی سەگی یارانی ئەشکەوت (ئەسحابول کەهف)ەوە.

بە کورتی - کەسێک دەرگای ماڵی ئەوی بە کراوەیی نەدیت و سفرەی نانیشی بەڕاخراوی چاو پێ نەکەوت.

خانە

دەروێش هەر بۆنی، چێشتی خۆی ئەکا

مەل، دوای نان خواردنی، چینەی کوێ ئەکا

بیستم ڕێگای زەریای ڕۆژئاوای بەرەو میسر دابووە بەرێ و هەوای فیرعەونییەی کەوتبووە کەللەیەوە، بایەکی بە هێز پێشی بە کەشتییەکە گرت و دەریا جۆشا "حتی اذا أدرکه الغرق" - واتە، هەتا نقومبوونی گەییە سەرێ.

خانە

بۆ شـــەقـڵـی مـــەلوولت چ بکا دڵ کـە نەســازێ

بای شـورتە[1] هەمووەدەم نایە، بەحەزی کـەشـتی

دەسـتی پاڕانەوە و نزای هەڵبڕی و دەسـتی بە هاوار و لالانـەوەی بێ کەڵک کرد "فـإذا رکـبـوا في الفلك دعـوا الله مـخلصين له الدين " واتە - هەر کـاتێ سـواری کەشتی بوون، هاواری دڵسۆزانە لە خوای مەزن دەبەستن و هاواری دەکەنێ.

خانە

دەســتی تکا بێ کەڵکە، بۆ کـەسـێکی لێقـەومـاو

کـاتی دوعـا بۆ خـوابێ و کـاتی سـەخـا لە باغـەڵ

پارچە

بەزێڕو زیوت، خـــۆشی بدە خـــەڵکی

خۆشت خۆش بژی، خێر لە خۆ نەدیو

ئەو خانووەی هەتە، هەر جێی دەهێڵی

خشـتێکی زێڕ بێ و خـشـتێکی لە زیو

وا دەگێڕنـەوە ئەو پیاوە کەسـوکـارێکی هەژاری زۆری لە مـیسـردا هەبوو، پاش مردنی، هەموویان بە ماڵەکەی خـەنی و دەوڵەمەند بوون و کۆنەکراسـیـان دڕین و ئاوریشمی دومیاتییان بەبەرخۆیان بڕین، هەر لەو هەفتەیەشدا، یەکێکم لەوان دیت سواری ئەسپێکی یەرغە بووە و غوڵامێکیشی بەغار بە دواوەیە، بەخۆمم گوت:

پارچە

وای ئەگـــەر مـــردوو، ئەگـــەڕایەوە

بە تیـــــرە و هۆزا، ئەســـــووڕایەوە

[1]. بای شـورتە: شورتـە: بایەکە بۆ کەشـتی ناو دەریا زۆر چاکـە و بە حـەزی ئەوە، (بای موافق) یشی پێ دەڵێن -غەریب پشدەری -

سەندنەوەی میرات، لە دەست واریسان
گرانتر ئەبوو، لە مەرگی خزمان

بەهۆی ئاشنایەتییەکی پێشووەوە کە هەمانبوو، کەلەنگوچکیم گرت و گوتم:

خانە

پیاوی باش بیخۆ، خوا بۆ تۆی هەنارد
کە ئەم بەدبەختە، گۆی کردۆ و نەیخوارد

٢٣- سەرگوزەشتە

ماسیی گرێکی لەڕ و لاواز و بێ تین، ماسییەکی گەورە و بە هێزی بە تۆڕەکەیەوە بوو، ماسییەکەی بۆ ڕانەوەستاو دەروەستی نەهات ڕایکێشێتە دەرێ، ماشەکەی لە دەست ئەستاند و ڕۆیشت، لە مەدا واقی وڕما و گوتی:

پارچە

کوڕێک چوو، تا ئاو لە ڕووبار بێنێ
ئاوی رووبار هات، کوڕەی ڕادا و برد
داو هەموو جارێ، هەر ماسی ئەگرێ
ئەمجارە ماسی، وا داوەکەی برد

ماسیی گرەکانی تر زۆریان پەرۆش بوو و زۆریشیان غەم لێ خوارد و زۆریشیان سەرزەنشت کرد لەسەر ئەوەی کە نێچیرێکی ئاوات بکەوێتە داوێوە و نەتوانی بیگری. وەڵامی دایەوە:

"ئەی برادەران! چبکەم؟ ئەوە بە مووچەی من نەبوو و بۆ خۆشی مووچەی مابوو"

دانایان گوتوویانە: "ڕاوچی بێ ڕزق و مووچە لە دیجلەدا ماسی ناگرێت و ماسیی بێ ئەجەلیش لە وشکاییەدا نامرێ.

خانه

ڕاوکەر گشت کاتێ، ناگات بەنیاز
ڕەنگە ڕۆژێ پڵنگ، بیدڕێ بە گاز

٢٤- سەرگوزەشتە

بێ دەست و پێیەک، هەزار پێیەکی کوشت، پیاوچاکێک بەلایدا تێپەڕی و گوتی: "گەورەیی هەر بۆ خوایە، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەزار پێی هەیە، بەڵام چونکە ئەجەلی هاتووە نەیتوانیوە لەبەر بێ دەست و پێیەکی هەڵێ".

دوو تاکی

کە لە دواوەت هات، دوژمنی گیان ئەستێن
ئەجەل ئەبەستێ، پێی پیاوی بەتێن

کە لەگەڵ دوژمن، دەبی یەکانگیر
بۆت بەکار نایە، نە کەوان نە تیر

٢٥- سەرگوزەشتە

گەوجێکم دیت، جلوبەرگێکی بەنرخ لەبەر و ئەسپێکی تازی (عارەبی) لەژێر و کڵاوێکی بە ئاوریشمی میسری چنراوی لەسەر، یەکێک گوتی: "سەعدیا! ئەم دیبایە جوان و بەنیشانەیە، لەبەر ئەم وڵاغە نەزانەدا چۆن ئەبینی؟" گوتم: "نووسینێکە و ناشیرین بە ئاوی زێڕ نووسراوە".

هۆنراو

کەرێ خۆی ڕانا، ئادەمیزادە
بە لەش گوێلپارە و بۆڕەی بەربادە

## پارچە

ئەم کـــەرە ناکــرێ، ببــێــتــە ئینســـان
هەر بەکراس، مێزەر، جبەی گوڵگوونی

چی لەبەردایە، هەمــووی کــۆمکــەی
حــەڵاڵی نیــیــە، مــەگــەر هــەر خــوونی

## پارچە

تۆ خـــــەیاڵت وانەبێ، شــــەریف پایەی نزم بێ
پایە و پلەی بڵندی، ئەکـــــەوتە نزم و کــــــزی

ئەگەر ئاستانەی زیوین، بە مێـخی زێڕ داکوترێ
باوەڕمەکە جوولەکە، شەریف بێ بە سەربەرزی

٢٦- سەرگوزەشتە

دزێک بە سـوالْکەرێکی گـوت: "ئەوە شـەرم ناکـەی بۆ دەنکە جـۆیەکی زیو، دەست لەبەر هەموو کەسێک و نەدیتکەیەک پان دەکەیتەوە!"، گوتی:

## خانە

دەســـــــتی دەرۆزە، بۆ یەک دەنکە زیـو
درێژکەی نەک بیبڕن، بۆیەک دانگ و نیو

٢٧- سەرگوزەشتە

دەگـێـڕنەوە مـسـت وەشـێنێ، کـە داد و بڕۆ و هـاوار و فـیـغـانی بوو لە دەست ناهەمواریی ڕۆژگار و دەستی زۆر کورت بوو و لە نەدارییان لە گیان بێزار بووبوو، سکالای خۆی بردە لای باوکی و داوای مۆڵەتی کرد و گوتی: "حەزم لەسەفەرێیە، بەڵکە بەهێزی بازووەکانم بە ئاوات بگەم".

خانه

فــەزڵ و هونەر بێ مــایەن، هەتا وەدەریان نەخــەی
میسک دەبێ بیسوویەوە، عوودیش وە سەر ئاگری کەی

باوکەکە گوتی: "کوڕی خۆم، خەیاڵی خاو لەسەرت دەرکە، پێی قەناعەت لە دامەن ئاڵاندن مایەی سەلامەتییەیە، گەورەکان فەرموویانە: "دەوڵەت بە تێکۆشان نییە، کەواتە چارە کەم هەڵچوونە".

خانه

کــەس ناتوانێ بیگرێ، دامــەنی دەوڵەت بە زۆر
کۆششێکی بێ کەڵکە، وەک وەسمە بۆ ئەبرۆی کۆر

خانه

گەر هەر سەرە مووێکت، دوو سەد هونەریان هەبێ
خۆشی لە خۆت نابینی، کە بەختی ڕەشتان هەبێ

خانه

چی بکا پیاوی بەهێز، گەر وەرگەڕابێ بەختی؟
بەختی بەهێز چاترە، لە قۆڵ و بازوو و جەختی

کوڕە گوتی: "باوکە! سەفەر سوودی زۆرە، شادی دڵ و دەروون و دیتنی شتی سەیر و سەمەرە و بیستنی گفتوگۆی نایاب و کۆکردنەوەی پلە و پایەی زانین و ئەدەب و ماڵی زۆر پەیداکردن و ناسینی برادەران و تاقیکردنەوەی ڕۆژگار و زۆر شتی تریش، هەروەک ڕێبوار و گەڕیدەکانی سەفەر گوتوویانە:

پارچە

هەتا لە مــاڵ و دووکــان دانیــشی
ئەی خــاو هیچ کــاتێ نابیتــە ئینسـان

برۆ دەرکەوە بەناو جیهانا و سەیرانێ بکە
بەر لەوەی ڕۆژێ، دەرچی لە جیهان

باوکەکە گوتی: "ئەی ڕۆڵە! سوودی سەفەر هەروەکو گوتت وایە و بێ ئەژمارە، بەڵام هەر بۆ پێنج تیرەو چینانە".
یەکەم - بۆ بازرگانێک کە بە توانا و بوونی خۆی، غوڵام و کەنیزە جوانەکانی و شاگردە چاپووک و چالاکەکانی هەر ڕۆژە لە شارێک و هەر شەوە لە جێگایەک و هەر دەمە لە سەیرانگایەکدا لە ناز و خۆشی دنیایە بەرخوردار ئەبێ".

پارچە

دەوڵەمەند لە دەشت و کێو، هەست بەغەریبی ناکا ڕوو
لە هەر جێیەک بکا، ڕەشماڵی خۆی هەڵ ئەدا

ئەوەی کە بێ موورادە، دەستی بە هیچ ڕاناگا
لە نیشتمانی خۆیدا، غەریبە لەناو گەلدا

دووەم - بۆ زانایەک کە بە وتە شیرین و هێز و توانای وتارە خۆشەکانی و چرو پری ڕاوێژ و بوێژی خۆی بچێتە هەر شوێنێک پێشوازی ئەکەن و لەهەر شوێنێک دانیشێ ڕێزی ئەگرن".

پارچە

هەبوونی پیاوی دانا، وەکو زێڕێکی ساغە
بۆ هەر جێگایەک بچێ، نرخی خۆی بۆ دانراوە

گەورە زادەیی نەزان، لە ناو شاری تێ مێنێ[1]
غەریبە لە وڵاتی خۆی، بێکەس و نەناسراوە

سێیەم - بۆ جوان ڕوویەک کە دڵ و دەروونی یاران لە ناخەوە حەز بە دۆستایەتییەی بکا، وەک کە گەوران گوتوویانە:

---

١. تێ مێنێ: دەستەوەستان ڕاوەستێ و هیچ نەزانێ.

"هەر وا کەمە جوانییەک، لە ماڵ و سامانی زۆر باشترە و روخساری جوان مەرهەمی دڵە دەردەدارەکانە، ئەو دڵانەی دەرگاکانیان داخراوە، ئیدی ئەوە دۆستایەتییەی بە هەل دەزانن و بۆ خزمەتکردنیی لێی نزیک دەبنەوە"

پارچە

جـــــوان بۆ هـەر جێ بچێ، رێزو رووەت ئەبینێ
باوک و دایک دەری کـەن، بە تووڕە بوون و لێـدان

پەڕێکی تاوسـم دیت، لە نـاو پـەڕی قـــــورئانـێ
پێم گوت: "کە ئەم جێگایە، ناگونجێ لەگەڵ ڕێزتان"

گـوتی: "وس بە هەر کـەسێک، کـە خـاوەنی جـوانی بێ
پێ لە هەر جـێیـە دانێ، ڕێزی ئەگرن بە دڵ و گیان

هەڵبەست

کـە کوڕ تێیدا بوو، جوانی و گـەشی
باکی نییـە باوکی، پێی نەدا خـۆشی

گـــەوهەرە و لەناو، ســـەدەفـــا دیارە
بۆ دوڕڕی نایاب، گشت کەس کڕیارە

چوارەم - بۆ دەنگ خـۆشـێک کە بە گـەرووی داودی ئاو لە ڕۆیشـتندا و مـەل لە فڕینا ڕابگرێ، ئەوجا هەر بەو دەنگەی دڵی هەموو کەسێ ڕاو بکا و یارانی ماقووڵ حەز بە هاودەمییەی بکەن.

هۆنراو

گوێم ها لە دەنگی، گۆرانییەکی خۆش
کـێـیــە وا تـاری، هێناوەتـە جـۆش؟

پارچە

چەند خۆشە دەنگی، بەسۆز و ناڵە
لە گوێی مەستانی مەی پڕی پەیمان[1]
دەنگی خۆش چاترە، لە ڕوخساری جوان
کە ئەم هی نەوسە و ئەویش هی گیان

پێنجەم - بۆ پیشەسازێک (سەنعەتکار) کە بەرەنجی قۆڵ و بازووی خۆی خۆراکی خۆی پەیدا بکا، تا لە پێناوی نانێکدا ئاوی ڕووی نەڕژێ، کە ئاقڵمەندان گوتوویانە:

پارچە

گەر لە وڵاتی خۆی بچێتە غەریبی
تەنگەتاو نابێ، وەستای پینەدۆز
پاشا لە وڵاتی، خۆیدا دامێنێ
بەزگی برسی سەر دەنێتەوە، پاشاکەی نیمرۆز[2]

ئەم ڕوونکردنەوانەی دامیتێ لە سەفەراندا هۆی خۆشگوزەرانی و دڵ جەمییە، ئەوەی لەوانەش بێبەش بێت، ئەوە لە ژیاندا بەخەیاڵی پووچەوە ئەژی و بەدنیادا دەڕوا و هیچ کەسێ ناو و نیشانی نازانێت و ناوی نابات و نابیسێ".

پارچە

ئەوەی سووڕانی گەردوون بە دژی ئارەزووی سووڕا
بە پێچەوانەی بەرژەوەندی ئەو ڕێنمایی ئەکا
کۆترێک کە ئیدی نەیویست هێلانەی خۆی ببینێتەوە
دەستی زەمانە بەرەو لای، شوێنی دانەو داو ئەیبا

---

١. پەیمان: پەیمانە: بادەی مەی.
٢. نیمرۆز: وڵاتی سیستان.

کوڕە گوتی: "ئەی باوکە! چۆن دەتوانم دژی وتەی زانایان بم کە گوتوویانە، خۆراک و مــــووچە ئەگـــەر چی بڕاوەتەوە و دابەش کـــراوە، بەڵام پێـــوەندی بەهۆی پەیداکردنیەوە هەیە و بەوەوە بەستراوە، بەڵێ ئەگەر چی ئەویش دەستنیشـان کراوە، بەڵام پێویستە خۆت لە چوونە ژوورەوەی بەو ناو دەرگایەدا بپارێزی"

پارچە

هەرچەندە ڕۆزی[1]، دیاری کــــــراوە
ئەبێ پەیدای کەی، لە دەشت و لەدەر
گەرچی بێ ئەجەل، هیچ کەس نامرێ
تۆش نابێ بچیە، ناو زاری ئەژدەر[2]

بەم جۆرە کە من کەللە لە کەللەی فیلی تووڕە ئەدەم و لەگەڵ شێری توندو تیژدا پەنجەبازی ئەکەم، وا چاکە بڕۆم و لەوە زیاتریشم تین و تاوی هەڵگرتنی باری هەژاری نییە.

پارچە

کــــە پیـــاو کـــەوت، لە پلە و پایە
غەمی نییە دنیا، گشت جێگای ئەوە
دەوڵەمەند شەوێ، ئەچێتەوە جێی خۆی
هەژار لە کوێ شەو، هات سەرای ئەوە
پیاوی خوا غەریب، نییە لە هیچ جێ
بۆ هەر کوێ بچێ، موڵکی خوای ئەوە

ئەمەی گوت و ماڵئاواییی لە باوکی کرد و داوای نزای لێ کرد و لێی دا ڕۆیی و هەر ئەشیگوت:

---

١. ڕۆزی: رزق
٢. ئەژدەر: ئەژدیهایەکە ئاگری لەزار دێتەدەر

خانە

کـە بەخـتی بەکـام، نـەبوو هـونەردار
بچـتـە هەر شـوێنێ، نابینێ ناسـیـار

تا گەیشتە لێوار ئاوێکی، لە تیژ ڕەویانی گابەردی بە گابەردی دادەدا و هاژەی فرسەخێک بەولاوەترەوە دەڕۆیی.

خانە

ئاوێکی سـامناکی وا، مـراوی ئەتۆقـێنێ
بچـووکـترین شـەپۆلی، بەرداشی ڕادەفـڕێنێ

کۆمەڵە پیاوێکی دیتن هەریەکە پارەی کرێی سـواربوونی کەشتی بە دەستەوە دانیشتوون و بارگەو بنەی سەفەریان ئامادە کردووە، لاوەکە دەستی بەخشینێی کورت بوو، زمانی ستایش و پێداهەڵگوتنێی کردەوە، چەندی پاڕایەوە ولاڵایەوە هاوەڵییان نەکرد و یارمەتییان نەدا. کەشتییەوانەکە بە نامەردییەکەوە بە پێکەنینەوە ئاوڕی لێدایەوە و گوتی:

هۆنراو

بێ زێڕ ناتوانی، لە کـەس بکەی زۆر
کە زێڕیشت بوو، پێویست نی بە زۆر

هۆنراو

زێڕت نەبێ ناتوانی، بە زۆر بچـیـە دەریاوە
هێزی دە پیاو بێ کەڵکە، زێڕی پیاوێکی بەسە

لاوەکە لە گاڵتەپێکردنی کەشتییەوانەکە دڵی توند بوو، ویستی تۆڵەی لێ بکاتەوە، کەشتییەکە کەوتە ڕێ، بانگی کەشتییەوانەکەی کردەوە و پێی گوت، ئەگەر بەو کراسەی کە لە بەرمە قایل ئەبی هەڵمگری قەیدی نییە ئەیدەم، کەشتییەوان چاوی لە کراسەکەوە بڕی و کەشتییەکەی گێڕایەوە.

خانه

چڵێسی ئەبەستێ، چاوی هۆشمەند
تەماح ماسی و مەل، ئەخاتە ناو بەند

کە دەستی لاوەکە گەیشتە یەخەو سەرو و ڕیشی کەشتییەوانی، ڕایکێشا و زۆر باشی بێزراز کرد و چاکی کوتا، برادەرەکانی لە کەشتییەکە هاتنە دەرێ تا لەسەری بکەنەوە، کوڕەیان زۆر بە تووڕەییەکی توندەوە دیت، نەیانوێرا خۆی لێدەن و هیچ چارەیەکیان نەما ئەوە نەبێ کە ئاشتیان کەنەوە و بەبێ کرێ سواری کەن و هیچی لێ وەرنەگرن.

دوو تاکی

کە تووشی شەڕ بووی، بار قووڵ بە و بێ دەنگ
نەرمی دای ئەخا، دەرگای هەرا و جەنگ
شلی کە کە دیت، توندی بوو گەرم
نابڕێ تیغی تیژ، ئاوریشمی نەرم
بەزمانی شیرین، بە نەرمی و خۆشی
بەمووێک ئەتوانی، فیلێک ڕاکێشی

خۆیان هاویشتە سەر دەست و پێی و لەوەی کە کردبوویان پۆزشیان هێنایەوە – بە دوو ڕووییەوە – چەند جارێکیان سەر و چاو ماچ کرد و چوونەوە ناو کەشتییەکەوە و ڕۆیشتن، هەتا گەیشتنە دینگە (پایە)یەک کە لە شوێنەواری یۆنانییەکانەوە مابووەوە و لە ناو ئاوەکەدا قیت چەقیبوو.

کەشتییەوانەکە گوتی: "کەشتییەکە گرفتێکی هەیە، یەکێک لە ئێوە کە لە خۆی ڕا دەبینێ و لە هەمووان بەهێز و تین و تواناترە بچێتە سەر ئەو دینگەیە و لەنگەری کەشتییەکە بگرێ تا چاکی ئەکەینەوە.

لاوەکە بەو ڕاپەڕموونەی کە لە ئازایەتی خۆیدا دەیدیت و لە کەللەی دابوو گوتی من ئەچم، بیری لە دوژمنی دڵ ڕەنجێندراوی نەکردەوە و کاری بە گوتەی دانایان نەکرد کە گوتوویانە:

"ئازارت بە هەرکەسێک گەیاند - ئەگەر دوای ئەمە بەسەد ئامانجیشی بگەیەنی، لە تۆڵەکردنەوەی ئەو تاکە ئازارەی دڵنیا مەبە، تیر ئەگەرچی لە زامیش دێتە دەر بەڵام ئێشەکەی لە دڵدا هەر ئەمێنێ.

خانە

بەگتاش[1] چەند جوانی، گوت بە خەیلەتاش[2]
دوژمنت کە ڕەنجاند، لێی وریابە باش

پارچە

بترسە لەوەی، کە لێت دڵ بەندە
لێت بە ئازارە و دڵی پڕ لە دەرد
بەرد مەهاوێژە، قەڵاتی هیچ کەس
نەک لە قەڵاوە، یەک تێت گرێ بەرد

کە پەتی لەنگەری کەشتییەکەی لە قۆڵیەوە پێچا و چووە سەر دینگەکە، کەشتییەوانەکە پەتی لەنگەرەکەی لە دەست ڕاکێشایەوە و کەشتییەکەی ئاژوا.

بێچارە حەپەسا، ڕۆژی دووەم هەرچی ناخۆشی و دەردەسەری هەبوو چێشتی، ڕۆژی سێیەم خەو یاخەی گرت و خستیە ناو ئاوەکەوە، پاش شەو و ڕۆژێکی دی، کەوتە کەنارەوە، نووزەیەکی ژیان تێدا مابوو، دەستی بە خواردنی گەڵای درەختان کرد و ڕەگی گیاو گۆڵانی دەردێنا و دەیخوارد تا کەمێک بەسەرخۆ کەوتەوە، ملی لە بیابانێ نا، هەر ڕۆیی تا لە تینووان پرزەی لێ بڕا، گەیشتە سەر چاڵاو (بیر)ێکی، کۆمەڵێکی لێ گرد بووبوونەوە و ئاویان بە پارە ئەدا لاوەکە هیچی پێ نەبوو، چەندی داواکرد و نەبوونی و بێ دەرەتانیی خۆی دەربڕی، بەزەییان پێیدا نەهاتەوە، ئەوجا دەستی زۆرداریەی درێژ کرد و ملی لە ملهوڕی نا هەر بێ سوود بوو، چەند کەسێکی کوتان، پیاوەکان دەستیان لێ ستاند، باشیان لێ دا و بریندار بوو.

---

١. بەگتاش: ناوی یەکێک لە پاشایەکانی خوارزمییانە

٢. خەیلەتاش: ئەمانە سوپایین، و هەموو لە یەک تیرە و هۆزن.

پارچە

مـێـشــوولە بفــڕێ، بە فــیل وەئەدا
لەســەر ئەو هــەمــوو هێــزەی بێ پایان
مـێـروولە کــاتێ، کــە یەکــتــر بگرن
هەڵ ئەدڕن پێـستـی، نەڕەشـێری ژیان

بەناچاری بەدوای کاروانێک کەوت و ڕۆیی، شەو گەیشتنە شوێنێک کە مەترسی زۆریان لە دزان هەبوو، کاروانچییەکانی دیتن لە ترسان دەلەرزین و خۆیان دابووە دەست مردنێ.

پێی گوتن: "نارەحەت مەبن، من یەکێکم لەگەڵ ئێوەدام بەتەنیا وەڵامی سەد پیاو ئەدەمەوە، با لاوەکانی تریش یاریدەم بدەن، کاروانچییەکان بەلاف و گەزاف و خۆ هەڵکێشـانی ئەو پشت ئەسـتوور و بەهاوڕێیەتیشی شـادمـان بوون و بە نان و ئاوێکی دەستەوەگرۆیی ئەویان بە پێویست زانی.

لاوەکە ئاگری گەدەی هەڵگیرسابوو و جڵەوی لەدەست دابوو، چەند پاروێکی بە ئارەزووەوە خـوارد و دوای تاوێک ئاوی بەسەردا کـرد، هەتا دێوی دەروونی هێـور بووەوە و خەو ڕایفڕاند و نووست. پیرەمێردێکی دنیا دیتە، لەگەڵ کاروانەکەدا بوو گــوتـی: "هـاوڕێیــان من لە دزان زیاتر ترسم لەو ڕابەرەی ئێــوەیە"، هـەروەکــو ئەگێڕنەوە، کـە ئەعرابییـەک چەند درهـەمێکی پاشـەکەوت کردبوو شـەو لە ترسی دزان، یەکـێکی لە دۆسـتـەکانی خـۆی بانگ کردە لای خـۆی چونکە بەتەنیـا بوو لە مـاڵێ، تاکو سـامی تەنیـایی بشکێ و ترسی نەمێنێ، دۆسـتەکەی چەند شـەوێکانی لەلا مـایەوە، تـا بە درهـەمـەکـانی زانـی، شـەوێکیـان هەمـووی بـردن و ڕۆیی، دەمی بەیانی ئەعرابییەکەیان بە ڕووتی و بەگریانەوە دیت یەکێک پێی گوت: "ئەوە چییە؟ ئەڵێی درهەمەکانت دز بردوونی؟ گوتی: "ناوەڵڵا! پاسەوانەکەیان بردنی"

پارچە

هەرگــیــز لە مــاری، ئەرخــەیان نابم
چونکە ئەزانم، خـــوو و ڕەوشـــتـی

زامی ددانی، کەسێ بەدترە
کە نایەتە بەر، دووچاوی دۆستی

هاوڕێیان: بەچی ڕا دەزانن کە ئەمەش لەو دزانە نییە؟ و خۆی لە ئێمە مەڵاس داوە تا کاتی دەرفەت پەیداکردن، هاوڕێیەکانی خۆی ئاگادار دەکاتەوە.

وای بە باش دەزانم، کە هەر ئاوا بە خەوتوویی جێی بهێڵین و بڕۆین. کاروانچییەکان پەند و ئامۆژگاری پیرەیان پەسند کرد، لە کوڕەی کەوتنە ترسەوە، بارگەو بنەیان پێچایەوە و باریان کرد و لاوەیان بە نووستوویی بەجێ هێشت.

کاتێ کە لاوە بە ئاگا هاتەوە هەتاوی لەشانان ئەدا، سەری بڵند کرد، کاروان و کاروانچییەکانی نەدیتن، هەژارە بێ دەرەتانە گەلێک گەڕا و سەری خۆی هێناو برد، سەری لە ڕێیەکی دەرنەکرد، بە تینوومتی و برسییەتی و بێ نەوایی، سەری خستەوە سەر زەوی و خۆی ڕادەستی مردنێ کرد، ئەیگوت:

خانە

(کێ دەمدوێنێ؟ کاروان تێپەڕی
تەنیا غەریبە، هاودەمی غەریب)

خانە

لەگەڵ غەریبان، یەکێک بەد ئەکا
کە نەی چێشتبێ، تاڵیی غەریبی

لە بەدبەختیانی، ئەو کاتەی کە ئەم قسانەی دەکرد کوڕە - پاشەیەک لە دەمە دەمی ڕاوێدا لە سوپاو بەردەستەکانی دوور کەوتبووەوە و هەڵبڕابوو هات و لەبان سەریەوە ڕاوەستا و گوێی لەم قسانە بوو، لێی ورد بووەوە دیتی، حاڵ و باڵ و دیمەنی جوان و پەرێشانی زۆر لانەوازە، لێی پرسی:

" کوێندەری؟ و چۆنە کەوتوویە ئەم جێگایە؟"

بەشێکی لە بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ گێڕایەوە، شازادە بەزەیی بە حاڵ و باڵی نابووت و پەرپووتیدا هاتەوە و پارە و خەڵاتێکی دایە و یەکێکی لەگەڵدا نارد، تا

گەیشتەوە شار و مەملەکەتەکەی خۆی:

باوکەکە بە دیداری کوڕەکەی شاد بووەوە و بەساغ و سەلامەتییەی زۆری سوپاسی خوای کرد، شەوێ هەرچی بەسەری هاتبوو دەربارەی کەشتی و کەشتییەوان و دەستدرێژیی لادێییانی سەر چاڵاوەکە و ناپیاویی کاروانچییەکانی ڕێگایە، هەمووی بۆ باوکی گێڕایەوە

باوکەکە گوتی: "کوڕی خۆم! پێم نەگوتی لە کاتی ڕۆیشتنێتدا کە پیاوی دەستکورت دەستی ئازایەتییەی بەستراوە و پەنجەی شێرایەتییەی شکاوە".

خانە

چەند جوانی گوتووە، دەستکورتی چەکدار

دەنکێ زێڕ چاترە، لە هێـــــزی زۆردار

کوڕەکە گوتی: "باوکە! تا ڕەنج نەدەی، گەنج نابەی و تا گیانبازی نەکەی بەسەر دوژمندا زاڵ نابی، تا تۆو نەوەشێنێ جۆخین هەڵناگری، نابینی بەو ڕەنجە کەمەی کە داومە چ ئاسوودەییەکم پەیدا کردووە و بەو چزە پێوەدانەی کە چێشتوومە چ مایەیەکی شیرینی هەنگوین ئاسام دەست کەوتووە"

خانە

بۆ هەمــوو کــەسێ براوەتەوە، ڕزق و خــواردنی

بەمەرجێ نەکەی سستی و تەمبەڵی، پەیداکردنی

خانە

غەوواس گەر بیری مەترسی نەهەنگ...

بکا، قەت دوڕڕی، ناکەوێتە چەنگ

"بەردەئاشی بنەوە نابزوێت، بۆیە باری گران هەڵ ئەگرێت"

پارچە

چ ئەخوا شێری نەڕ، لە بنی ئەشکەوتێ
یا بازی کەوتوو، هێزی لە کوێ بوو
گەر تۆ ئارەزووی ڕاو کەیت لە ماڵێ
دەست و پێت وەک ئی جاڵجاڵۆکێ بوو

باوکەکە گوتی: "کوڕی خۆم! ئەم جارەیان فەلەک یاوەری و بەخت ڕێبەری کردی، تا گوڵی لە دڕکت و دڕکی لە پێت دەرهێنا، شازادەیەکت گەیشتێ و ئاوڕی لێ دایتەوە و حاڵی ناهەموار و باری کەوتووی ڕاست کردیتەوە. ڕێکەوتی وا بە دەگمەن ڕوو ئەدات و داوەرییش لەسەر شتی دەگمەنیش ناکرێ، زینهار، نەکەویە ئەو داوەوە.

خانە

ڕاوچی گشت جارێ، ڕێوی ناگرێ
ڕەنگە جارێکیش، پڵنگ بیدڕێ

هەروەها، یەکێک لە پاشایەکانی پارس - خوا دەست بە باڵیەوە بگرێ - قاشێکی زۆر بەنرخی لە ئەنگوستیلەکەیدا هەبوو جارێکیان لەگەڵ چەند کەسێکدا لە هاودەم و یارانی خۆی بە سەیران ئەچووە مزگەوتی شیراز. فەرمووی ئەنگوستیلەکەیان لەسەر گومبەدی "عضد" بە نیشانەدا کرد، تا هەرکەسێک تیری لەناو ئاڵقەی ئەنگوستیلەکە دا، ئەنگوستیلەکە ئەبێتە هی ئەو.

وا ڕێک کەوت چوار تیرهاوێژی ئەنگێو لە خزمەت پاشادا بوون، تیریان لە کەوان کێشا بەڵام هیچ کامێکیان نەیان ئەنگاوت، تەنیا منداڵێک نەبێ لەسەربانی خانێکی بە گەمەوگاڵتەوە تیری بەولاو لایاندا داویشت، شنەبای شەماڵێک تیری منداڵەکەی برد و بە ئاڵقەی ئەنگوستیلەکەیدا برد، پاشا خەڵات و دیارییەکی زۆری دایە و ئەنگوستیلەکەشی پێ بەخشی"

وا ئەگێڕنەوە منداڵەکە تیروکەوانەکەی سووتاند، پێیان گوت:

"ئەوە بۆ وات کرد؟ وەڵامی دایەوە تا تامی سەرکەوتنی یەکەم جارم هەر وەک خۆی بمێنێتەوە".

پارچه

وا دەبێ ڕۆژێک، دانای ڕۆشنبیــر
نەتوانێ بکا، بەباشی تەگبیــر
منداڵێکی چووک، ڕۆژێ بە گاڵتــە
بەهەڵە ئەدا، لە ناو ئامانج تیــر

٢٨- سەرگوزەشتە

بیستم دەروێشێک لە ئەشکەوتێکدا دەرگای دنیایەی لەسەر خۆی داخستبوو، پاشاو فەرمانڕەوا و سوڵتان، لای ئەو چ بایەخ و نرخێکیان نەمابوو.

پارچە

هەر کەسێ دەستی، کرد بە سواڵکردن
هەر سواڵ ئەکا، هەتاکو مردن
تەماح فڕێدە و ببە بە پاشا
کەسی بێ تەماح، سەر بەرزە و گەردن

یەکێک لە فەرمانڕەوایانی ئەو هەرێمە، داوای لە دەروێش کرد کە هیوام بە خوو و خدە و ڕەوشتی گەورە پیاوان زۆرە کە بۆ نانخواردنێک لەگەڵ ئێمەدا بفەرموون پێکەوە نانێک بخۆین، پیر قبووڵی کرد، چونکە قبووڵکردنی هەموو داوەتێک سوننەتە. ڕۆژی دووەم فەرمانڕەوا بۆ خۆی چووە پێشوازی خواپەرستەی، ئەویش لە بەری هەستا و لە باوەشێی گرت و ڕووی پێشان دا و نزای بۆ کرد.

کە فەرمانڕەوا ڕۆیشتەوە، یەکێک لە یاران لە پیری پرسی و گوتی: "ئەرێ ئەوڕۆ بە پێچەوانەی بیروڕای خۆت گەلێکت دڵسۆزی لەگەڵ فەرمانڕەوایدا نواند"

وەڵامی دایەوە: "ئەی ئەمەت نەبیستووە کە گوتوویانە:

خانە

لەسەر خوانی، هەر کەس دانیشتی
بەگشت خزمەتی، ئەو دەبێ هەستی

## دوو تاکی

گـوێچکە ئەتوانێ، گـشت ئەو تەمـەنەی
نـەبـیـێ ئـاوازی، دەف و چـەنـگ و نـەی

چاو ئارام ئەگـرێ، لە تـەمـاشـای بـاغ
بێ گـوڵ و نەسـرین، هەڵ ئەکـا دەمـاغ

گەر سەرینی توویک، دەست نەکەوت یەکسەر
ئەتوانی بنووی، بەرد خـەیتـە ژێر سـەر

یان دولبـەر نەبوو، بۆ خـەوی شـەو بۆت
ئەتوانی دەسـتت، کـەیتـە باوەش خـۆت

بەڵام ئەم زگـە، بێ خـێـرەی پیچ پیچ[1]
ئارام ناگـری و ناسـازێ بە هیچ

۱. پیچ پیچ: پێچ پێچ

## دەرگەی چوارەم

# لە سوودی خامۆشی "بێدەنگی"

١- سەرگوزەشتە

بە یەکێک لە دۆستەکانم گوت: "بۆیە قسە ناکەم، چونکە، زۆر جاران قسە بە چاک و بە خراپ ئەکرێ و چاوی دوژمنانیش خراپە نەبێ هیچی تر نابینێ" گوتی:

"دوژمن واچاکە، چاکی و باشی هەر نەبینێ".

هۆنراو

بەلای پیـــاوچاکـــا، ڕانابرێ دوژمـن
مـــــەگـــــەر بۆوەی بڵـێ، زلە درۆزن

خانە

هونـەر لە چاوی دوژمنـاندا، عــەیبــێکی گــەورەیە
سـەعـدیش گوڵێکە نایاب، کە لای دوژمنـان دڕکە

خانە

ڕووناکی ئەم جـیـهـانە، تـیـشکی ڕووناکی خـۆرە
کـەچی ناشـیـرین شـتـە، بە چاوی مـشـکە کـوێرە

٢- سەرگوزەشتە

لاوێکی ژیر لە هونـەری زانستدا بەختێکی زۆر باش و بیرێکی زرنگی هەبوو، هەر جارێکیش کە لە کۆڕی زانایاندا دانیشتبایە، زمانی قسەکردنێی گرێ ئەدا و بەبێـدەنگی دادەنیـشت. جـارێکیـان باوکی پێی گـوت: "کـوڕی خـۆم! تۆش لەو

شتانەوەی کە دەیانزانی بۆ قسەیەک ناکەی؟ وەڵامی دایەوە: "ئەترسێم پرسیارم لەوەی لێ بکەن کە نایزانم و شەرمەزار ببم"

پارچە

نەتبیستووە سۆفییەک، بزماری ئەدا
لە ژێر پاژنە پێی، هەر دوو ناڵچەکەی
سەربازێک گرتی و دایە پێشە خۆی
پێی گوت: "ئەبێ بێی، ئەسپم بۆ ناڵ کەی"

پارچە

کەس کاری نییە، تا پیاو بێ دەنگە
کە هاتیە قسە، پێت دەڵێن: بەڵگە!

٣- سەرگوزەشتە

بازرگانێک هەزار دیناری زەرەر کرد، بە کوڕەکەی خۆی گوت: نابێ ئەم قسەیە لای هیچ کەسێک بدرکێنی.

گوتی: "باوکە فەرمانەکەت بەجێیە، بەڵام ئەمەوێ بزانم ئەمە چ بەرژەوەندییەکی تێدایە و باشییەکەی چییە؟ گوتی تا نەگبەتییەکە نەبێتە دووان: یەکێکیان کەمایەسی مایە و ئەوەی تر پێ خۆشبوونی هاوسایە.

خانە

ناخۆشی خۆت لای دوژمنان، هەرگیز مەڵێ
با لە خۆشییان (لاحول) یکت، لە بۆ نەڵێ

٤- سەرگوزەشتە

گفتوگۆیەک لە نێوان زانایەکی گەورە و بە ڕووەت و بێ باوەڕێکدا - نەفرەتی خوای لێ بێ - ڕووی دا، بە هیچ بەڵگەیەک بەسەریا زاڵ نەبوو و بەسەریا سەرنەکەوت، تووڕە بوو و ڕۆیی.

یەکێک پێی گوت: "تۆ بەم هەموو ئەدەب و زانینەوەی کە هەتە، لەگەڵ بێ ئاینێکی وات پێ نەکرا"

گوتی: "زانینی من، قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر و قسەو پەند و ئامۆژگاری پێشینانە و ئەویش باوەڕی بەمانە نییە و گوێیان لێ ڕاناگرێ، ئەی کەواتە من بیستنی کفری ئەوم بە کەڵکی چی دێ"

خانە

ئەوەی بڕوای بە قورئان و حەدیس نەبێ، بە هیچ جۆر
وەڵامەکەی ئەوەیە، وەڵامی نەدەیتەوە کەم و زۆر

٥- سەرگوزەشتە

"جالینووس"ی دانا، شێتێکی دیت دەستی لە خنخنۆکی زانایەکی ناوە و بێ ڕێزیی پێ دەکا، گوتی: "ئەگەر ئەمە دانا و زانا بووایە، لەگەڵ نەزانێکی وادا نەئەگەیشتە ئەم ڕادەیە، کە گوتوویانە".

دوو تاکی

دوو ژیر نایان بێ، ڕق و کینە و جەنگ
دانا قەت ناکا، لەگەڵ تووڕە دەنگ

گەر جنێویش دا، نادانی بێ بیر
لەسەرخۆ و بەڕێز، لێی وەرئەگرێ ژیر

دوو پیاوی چاکە، موویەک ڕائەگرن
بە نەرمی دڵی، دوژمنان ئەکڕن

گەر نادان تووشی، نادان هات جارێ
زنجیر لە بەینیان، ئەپچڕێ بارێ

یەکێ جنێوی دا، بە یەکێکی تر
هەڵی گرت پێی گوت، ئەی لە من چێتر

لەوە خـــــراپتـــرم، کـــە تۆ ئەیزانی
عەیبی خۆم وەک خۆم، هەرگیز نازانی

٦- سەرگوزەشتە

"سویحانی وائیل" یان لە دەم و ڕاوێژدا، بێ هاوتا داناوە، لەبەرئەوەی بە درێژایی ساڵێک کە قسەی ئەکرد وشەیەکی دووجار لە قسەکانیدا دووبارە نەدەکردەوە و ئەگەر هەر وتاریشی هاتبایەوە پێشێ ئەوا بە وشە و دانانێکی جیاوازترەوەی دەکوتەوە و یەکێکیش لە دانیشتن و ئادابی هاودەمی پاشایانیش ئەمەیە.

دوو تاکی

قسە ئەگەرچی، شیرنە و بەتێنە
شایستەی قبووڵ، پەسەند ستێنە
کە جارێکت گوت، مەیڵێوە هەروا
هەر جارێک خۆشە، خواردنی حەلوا

٧- سەرگوزەشتە

لە دانایەکم بیست کە ئەیگوت، هەرگیز کەس پێی لە نەزانینی خۆی نەناوە، مەگەر ئەو کەسەی کە کەسێکی تر لە قساندا بێ و هێشتا لێ نەبووبێتەوە، ئەو دەست بە قسان بکا.

دوو تاکی

ئەی هۆشیار! قسە، سەری هەیە و بن
لەناو قساندا، قسەکەر مەبن
گەر خاوەن هۆش و بیر و فەرهەنگی
نادوێی تا نەیە، کاتی بێدەنگی

٨- سەرگوزەشتە

چەند کەسێک لە نزیکەکانی "سوڵتان مەحمود" بە "حەسەن مەمەندی" یان گوت: "ئەورۆ سوڵتان لەبارەی ئیشی فڵانەوە چی گوت" گوتی: "ئیشەکە لە ئێوەش شاراوە نییە، گوتیان: "ئاخر ئەوەی کە بەتۆی ئەڵێ - کە پشتیوانی تەختی پاشایەتیت و ڕاوێژکاری هەڵسووڕانی کاروباری وڵاتی - دیارە بە هی وەکو مەمانانی ناڵێ.

گوتی: "لەبەرئەوەی کە ئەزانێ بەکەس ناڵێم، بۆیە بەمن دەڵێ، جا کەواتە بۆ دەپرسن".

خانە

هەموو قسەیەک، ئی کردن نییە لەلای پیاوی ژیر

ئەوەی نهێنی شا بڵێ سەری، دێنێتە بەر شیر

٩- سەرگوزەشتە

لە کڕینی خانووێکی دوودڵ بووم، جوولەکەیەک گوتی: "بیکڕە! چونکە من لە دانیشتوانی کۆنی ئەم گەڕەکەم، چۆنیەتی ئەم خانووە - هەروەکو هەیە - لە من بپرسە، هیچ عەیبێکی نییە"

گوتم: "تەنیا عەیبەکەی ئەمەیە کە تۆ ئەبیبە دراوسێم".

پارچە

خانووێک دراوسێی، یەکی وەک تۆبێ

دە درهەم زیوی، قـــــەڵپ ئەهێنێ

بەڵام من ئەبێ، ئومـــــێـــــدەواربم

کە دوای مەرگی تۆ، هەزار ئەهێنێ

١٠- سەرگوزەشتە

یەکێک لە شاعیران چووە لای گەورەی دزان و ستایشی کرد و پێی هەڵگوت.

گەورەی دزان فەرمووی: "ڕووتی کەنەوە" کە بەڕووتی دەڕۆیی سەگەلی کەوتنە دوا، ویستی بەردێکی هەڵگرێتەوە. زەوی سەهۆڵبەندان بوو و بۆی هەڵ نەگیرایەوە، گوتی: "ئەم پیاوانە چەند زۆڵن، سەگیان بەرداوە و بەردیان بەستوونەوە".

گەورەی دزان لە ژوورێوەی چاو تێوە بوو و گوێی لێ بوو، پێ کەنی و گوتی: "ئەی پیاوی دانا! شتێکم لێ بخوازە!"

گوتی: "ئەگەر بەخششێکم ئەدەیتێ، بەرگەکانی خۆمم ئەوێتەوە"

نیو هۆنراو

(لەجیاتی بەخششت، بە ڕۆینێ ڕازین)

خانە

پیاو بە ئومێدە، بۆ چاکەی کەسان
چاکەی تۆم ناوێ و لێم مەدە زیان

سەرۆکی دزان بەزەیی پێدا هاتەوە بەرگەکانی دایەوە و کەواو کەوڵێکیشی بۆ هاویشتە سەرێ و چەند درهەمێکیشی پێ بەخشی.

١١- سەرگوزەشتە

ئەستێرەناسێک چووەوە ماڵێ، پیاوێکی بێگانەی دیت لەگەڵ ژنەکەی دانیشتووە، کەوتە جنێو پێدانی و زۆری سەرکۆنە کرد و بوو بەهەڵڵا و هەنگامە و تێک هەڵدان، پیاوچاکێک پێی زانی،

خانە

تۆ چۆن ئەزانی، گەردوون چی تیایە
کاتێ- نەزانی، ماڵت کێی تیایە؟!

١٢- سەرگوزەشتە

خەتیبێکی دەنگ ناخۆش، خۆی زۆر بە دەنگ خۆش ئەزانی هەروا لە خۆشییەوە دەنگی بەرز ئەکردەوە، ئەتگوت قیڕەی بۆقێی لە گەروویدایە و ئەم ئایەتی "ان أنکر

الاصوات لصوت الحمير"مش لەبارەی ئەوەوە هاتووەتە خوارێ.

"هەرکە دەی زەڕاند (ئەبول فەواریس)

دەشـلـەقـا حـەوزی ولاتی فـاریس"

خەڵکی گوندی، لەبەرئەوەی کە ڕێزێکیان بۆ دادەنا، دەرد و ئازار و ناخۆشی ئەو بەلایەیان لە هەناوی خـۆیان دەکـردەوە و نارەحـەتیـان نەدەکـرد، تا یەکـێک لە خەتیبانی ناوچەکە کە لە دڵدا خۆشی نەدەویست، بەسەردان هاتە لای و پێی گوت:

"خەونێکم پێوە دیوی".

گوتی: "خێربێ ئیشاڵلا! چیت دیوە؟"

گوتی: "دەخەوێمدا دیت، دەنگ و ئاوازێکی یەکجار زۆر خۆشت هەبوو و خەڵکی هەموو لە خۆشیانی و لە پیرۆزییە تۆوە حەسابوونەوە، خەتیبەکە کەمێک داما و گوتی:

"خەونێکی پیرۆزت دیوە، منت لە عەیبی خۆم وریا کردەوە وا پێ دەچێ من دەنگم زۆر ناخۆش بێ و خەڵکی لێم کەوتبنە تەقە و بێزار بووبن، پەیمان بە خۆم ئەدەم کە هیچی تر خوتبە نەخوێنمەوە.

پارچە

لە قسەی دۆستانێک، کەوتوومە ئازار

ڕەفـتـاری خـراپـم، ئەکـەن بە چاکـە

خـەوشم بـە هونـەر و کـەمـاڵ ئەبینن

بە دڕکم ئەڵێن، گـوڵێکی پاکـە

کـوا ئەو دوژمنە سـەر ڕەقـە، بێ ترس

کـە عـەیبم دەڵێ و لە من بێ باکـە

١٣- سەرگوزەشتە

یەکـێک لە مزگـەوتی ژەنگار هەروا بە خـۆڕایی بانگی ئەدا، بانگدانەکـەی هێندە ناخۆش بوو خەڵکەکە نەفرەتیان لێ دەکرد، خاوەن مزگەوتەکە شازادەیەک بوو داد

پەروەر و ڕاست و خوو و ڕەوشت بەرز، نەی ئەویست دڵی بانگدەرەکە بڕەنجێنێ.

گوتی: "ئەی لاو! ئەم مزگەوتە دوو بانگدەری کۆنی هەیە، هەریەکەی پێنج دینارم مووچە بۆ بڕیونەوە، ئێستاش وەرە دە دینارت ئەدەمێ بچۆرە جێگایەکی تر، لەسەر ئەمە ڕێک کەوتن و ڕۆیی.

پاش ماوەیەک گەڕان هاتەوە لای شازادە و گوتی: "گەورەم! غەدرت لێ کردم، کە بە دە دینار منت لێرە دوورخستەوە، کەچی ئێستا ئەو جێگایەی لێمە، بیست دینارم ئەدەنێ، هەر هێندە بچمە جێیەکی تر و من ناچم".

شازادە پێ کەنی و گوتی: "نەکەی وەری گری، هێندەی پێ ناچێ بە پەنجا دیناریش مەمنوون ئەبن بتدەنێ"

خانە

بە تەشوێ لە بەرد، کەس ناتاشێ گڵ
وەک بانگی زبرت، هەڵ ئەکەنێ دڵ

١٤- سەرگوزەشتە

دەنگ ناخۆشێک بە دەنگێکی بەرزەوە قورئانی ئەخوێند، پیاوچاکێک بەلایدا تێپەڕی و گوتی: "مووچەی مانگانەکەت چەندە؟" گوتی: "هیچ"

گوتی: "کەواتە خۆت بۆ هێندە ماندوو ئەکەیت؟"

گوتی: "لە ڕاهی خوای ئەخوێنم"

گوتی: "دە سا وەرە، لە ڕاهی خوا مەیخوێنە".

خانە

ئەگەر خوێندنی قورئانی پیرۆز، ئاوا ئەزانی
ئەبەی ڕەونەقی قورئان خوێندن و ڕێی موسوڵمانی

دەرگەی پێنجەم

# لە ئەوین و لاوێنیدا

١- سەرگوزەشتە

بە حەسەن مەمەندیان گوت، کە سوڵتان "مەحموود" چەندان بەندە و غولامی جوان و لاوچاکی هەن، کە هەریەکەیان نەورەسێکی جیهانن، کەچی ئەوەندەی کە "ئەیاز"ی خۆش دەوێ لەگەڵ هیچ یەکێک لەوانەی تردا ئەو پێوەندی و خۆشەویستییەی نییە، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەیاز هێندەش جوان نییە؟

گوتی: "هەرچی چووە ناو دڵانەوە، لەبەر چاوان دیارترە"

هەڵبەست

ئەوەی کە کەوتە، بەر دڵی سوڵتان
خراپەکاریشی، هەر باشە و جوان
بەڵام ئەوەی شا، بەلاوەی ئەنێ
کەس و کاریشی، ڕێزی نادەنێ

٢- سەرگوزەشتە

ئەڵێن پیاوێکی مەزن بەندەیەکی زۆر نایاب و جوانی هەبوو و بە چاوی خۆشەویستی و ئاینەوە سەیری دەکرد، بە یەکێک لە دۆستانی خۆی گوت: "خۆزگە ئەم بەندەیەی من لەگەڵ ئەو هەموو جوانییەیدا کە هەیەتی، هێندەی زمان درێژی و بێ ڕێزی نەکردبایە، وەڵامی دایەوە: "براله: مادام ددانت بە دۆستایەتییەیدا هێنا تازە بە تەمای خزمەتی مەبە، چونکە کە ئەوین و ئەوینداری و خۆشەویستی کەوتە نێوانێوە. خاوەنداریەتی و بەندایەتی، لە نێواندا هەڵدەگیرێ و نامێنێ.

پارچە

که خودان لەگەڵ، بەندەی پەری ڕووی
کەوتە دەستبازی، بە یاری و خەندە
دەبێ ئەویش وەک، خودان ڕەفتارکا
نازی هەڵگرێ، ئەویش وەک بەندە

خانە

کۆیلە هەر ئەبێ، ئاو و خشت بێنێ
کە نازپەروەر بوو، دەست ئەوەشێنێ

٢- سەرگوزەشتە

خواپەرستێکم دیت گیرۆدەی داوی خۆشەویستییەک بوو بوو، نە ئارامیی لەبەر مابوو و نە توانای قسە و گفتوگۆ، تا سەرزەنشت دەکرا سۆزی زیاتر دەبوو و وازی لە خۆشەویستییەکەی هەر نەهێنا و ئەیگوت و ئەیگوتەوە:

پارچە

دەست لە دامانت، هەرگیز بەر نادەم
گەر بە شیرێکی دەم تیژ، بدەی لێم
دوای تۆ هیچ پەنا و پشتێکم نییە
پەنای بۆ بەرم، هەر بۆلای تۆ دێم

جارێکیان سەرزەنشتم کرد و لێم پرسی: ئەدی ئەقڵە گەورەکەت چی لێ هات؟ کە ئاوا نەفسی پیست بەسەردا زاڵ بووە، کەوتە سەر دەستان و گوتی:

پارچە

کە سوڵتانی عەشق، ڕووی کردە جێیەک
بۆ تەقوا هێزی، بازوو نامێنێ

کەی ئەو بێچارە، دامەن پاک ئەبێ؟
تا یەخەی لە قوڕ و لیتەدا بمێنی

٤- سەرگوزەشتە

دڵدادەیەک وازی لە گیان هێنابوو، ئەوەی ئەو بە تەمای بوو جێی مەترسی و گومانی تێداچوونی تێدا بوو، نەک پاروویەکی پڕ بە دەم خۆش و یا مەڵێکی نێو دانە و داو و بەردەست بێ.

خانە

زێڕ بە یارەوە، گەر خۆی نەنوێنێ
لەبەرچاو خۆڵ و خاشاک ئەنوێنێ

جارێکیان بە ناوی ئامۆژگارییەوە پێیان راگەیاند کە لەم خەیاڵە مەحاڵە خۆی دوور خاتەوە، چونکە گەلێک کەسی تریش بەم حەز و ئارەزووەوەی کە تۆ هەتە کەیل و وەیلانن و پێی دڵیان زنجیرە، ناڵاندی و گوتی:

پارچە

بە دۆستان بڵێن، شیرەتم[1] ناوێ
من چاوەڕوانی، ئارەزووی ئەوم
بەهێزی قۆڵ و بازوو، شەڕکەران
دوژمن ئەکوژن، جوانان هاودەوم

ئەوە پیاوەتی و مەرجی مەردایەتیی نییە لە ترسی گیان دەست لە خۆشەویستییە دڵبەری گیان هەڵگری.

دوو تاکی

هەر غەمی خۆت بێ، بۆ خۆشەویستن
لە عیشق بازیدا، ئەبیە درۆزن

١. شیرەت: ئامۆژگاری: نەسیحەت

کاتێ دەستیشت، نەگەیشتە یارێ
مەرجی عیشقە بۆی، بمری بە جارێ
ئەگەر دەست بدا، دامەنی ئەگرم
دەنا ئەچمە بەر، دەرگاکەی ئەمرم

دۆستەکانی کە ئاوایان چاو پێ دەکەوت، دڵیان بە حاڵی دەسووتا و بەزەییان پێدا ئەهاتەوە و پەند و ئامۆژگارییان بۆ دا ئەدا و بەزنجیر ئەیان بەستەوە، هەر بێ سوود بوو.

خانە
دەردی من هێند سەختە، گووژاڵکی ئەوێ
چاوچنۆکی نەفسی برسیشم، لە من شەکری ئەوێ

دوو تاکی
ئەمە دڵبەرێک، ئەیگوت بەبێ دەنگ
بە عاشقێکی دڵ دەرچووی لە چەنگ

تا تۆ ڕێزی خۆت، ئاوا ڕابگری
ئەی ڕێزی من چەند، لەبەرچاو ئەگری؟

ئەگێڕنەوە ئەو شازادەیەی کە ئەو بەتەمای بوو و چاوی تێوە بڕیبوو، ئاگادار کرایەوە کە کوڕە لاوێکی خوو و ڕەوشت و زمان شیرین هەمیشە لەم سەرمەیدانەیە و وشەی خۆش و شیرینی لەدەم دەبارێت و سەرگوزەشتەی سەیر سەیریشی لێ ئەبیەن، وا دیارە شۆڕێ لە کەللەیدا و سۆزێکی لە جگەردایە وە عاشقان دەچێ، شازادە کە زانی دڵی بەمەوە هەڵاوەسراوە و لە بەلای ئەوەوە ئالاوە، سەری جڵەوێی بەرەو لای ئەوەوە شل کرد و ئاژوای، کە لاوە هەستی کرد شازادە لێی نزیک دەبێتەوە گریا و گوتی:

خانە

ئەوەی منی کوشت و وا دیسان گەڕایەوە
ئەڵێی دڵی بە کوژراوی خۆی سووتایەوە

هەرچەندە بە خۆشی و بەلوتفەوە دواندی و لێی پرسی، چۆنی و کوێندەری و ئیش و کارت چییە؟! لاوە وا لە بنی دەریای خۆشەویستیدا نقوم بووبوو، هەناسەی لێ بڕابوو.

خانە

حەوت بەشی[1] لەبەر، بڵێی بە جوانی
هەرکە عاشق بووی، بێ تێ نازانی

شازادە گوتی: "ئەوە بۆ نامدوێنی؟ خۆ منیش هی ناو کۆڕی دەروێشانم و ئاڵقە لە گوێی ئەوانم، ئەوجا سەری لە ناو شەپۆلەکانی خۆشەویستییەوە بەرز کردەوە و گوتی:

خانە

سەیرە! بە بوونت، بوونم بمێنێ
کە هاتیە قسە، قسەم بمێنێ

ئەم چەند وشانەی گوتن و هاوارێکی کرد و گیانی لە دەست دا.

یەک تاکی

سەیر نییە لە کوژراوێ، لە دەرگای چادری یار
سەیرە لە زیندوو کە چۆن، گیانی دەرکرد بەساغی

٥- سەرگوزەشتە

کاتێک لە (هەرات[2]) چوومە خانەقای پیرێکی، دیم لاوێکی جوان و ڕووخۆش و قسەخۆش، بە تەنیشتِ پیرەکەیەوە دانیشتووە، بەخۆمم گوت: خوایە، خوایە! پیری چەماوە بەختی چەند لاوە، کە لاوێکی ئاوای هاودەمە....

---

١. حەوت بەش: مەبەستی حەوت بەشی خوێندنی قورئانە بە تەجوید.

٢. هەرات: شارێکە لە ئەفغانستان و لە نزیک سنووری ئێران.

پیر بە نەفەسی پاکی خۆی تێگەیی و گوتی: "ناوت چییە؟"
گوتم "حەبیب" م، گوتی: "خەڵکی ئەم وڵاتەی؟" گوتم:
"نەخێر غەریبم". گوتی: "حەبیبا ئێمەی جووتەی پیرو لاوت چۆن دیت؟" گوتم: "تۆ پیری سەنعان و ئەویش شۆخی کەنعان".
پیر بەم گوتەیە، کەوتە سەما و گۆرانی، گوتی: "بەو خوایەکەم، کە ئەم لاوە بەڕاستی و دروستی و بەخوو و ڕەوشتەکەی کوڕی منە ئەگەر حەزیشت لێیەتی ئەوا بە تۆی دەبەخشم" گوتم: "نەخێر بەندەی ئاوا، گەورەی ئاوای بێ چاترە"

## پارچە

گوڵ وای باشترە، لە ناو چەمەن بێ
تا وا شاداو و گەش و دەگمەن بێ

سەوزە ئەو دەمە، گەش و پاراوە
کە جێی لە دەم جۆی، ئاو و زەمەن بێ

خۆش ڕوو شایەدی، ئەوەندەی بەسە
لای گەورەکەی خۆی، وەک نارەوەن بێ

٦- سەرگوزەشتە

یەکێک لە قوتابیان تا بڵێی جوانییەکی بێ ئەندازە جوان بوو و شێوە و گوفتار و ڕەفتاریشی تا بڵێی ڕێک. مامۆستا بە هەستی مرۆڤانەی خۆی سەرو سەودایەکی لەگەڵ جوان پێستیدا هەبوو و ئەو سەودا و مامەڵە و سەرزەنشت و توندوتیژییەشی کە لەگەڵ قوتابییەکانی تریدا ئەنواند، لەگەڵ ئەمەیانی نەدەکرد و نەیبوو. کاتێکیش کە بە جووتە و بە تەنیا دەمانەوە ئەیگوت:

## پارچە

هێندە بە تۆوەم ئەی ڕوو بەهەشتی
کە بۆ خۆم خۆمم، لا نەماوە بیر
ناتوانم هەرگیز، ڕووت لێ وەرگێرم
گەر ڕووبەڕووی خۆم، ببینم دێ تیر

جارێکیان کوڕە پێی گوت: هەروەک لە شێوازی خوێندنەکەمەوە چاوت لێمە و ئاگاداریم دەکەی، پێم خۆشە ئەگەر لە خوو و ڕەوشتیشمدا نابەجێیی و ناپەسندییەک هەبوو ئاگادارم بکەیتەوە تا هەوڵ بدەم بیگۆڕم و چاکی بکەم، گوتی:
"کوڕەکە، ئەم وتەیە لە یەکێکی تر بپرسە چونکە من ئەو تێڕوانینەی کە بەرامبەر تۆ هەمە لە هونەر زیاتر هیچی تری پێ لە تۆدا نابینم.

پارچە

با چاوی بەدبین، کوێرایی دابێ

کە هونەری بە عەیب، لەبەر نەزەرە

لەگەڵ هونەرێک، حەفتا عەیب هەبێ

دۆست نایانبینێ، مەر ئەو هونەرە

٧- سەرگوزەشتە

لە یادمە شەوێک، کە یاری خۆشەویستم هاتە ژوورەوە، هێندە بە بێ ئاگایی هەستامە سەر پێ، کە چرایەکە بە سۆرانی (فەقێیانی) یەکەم کوژایەوە.

خانە

(ڕوویەک دەرکەوت، لە کاتی شەوا

بەدەرکەوتنی، تاریکی نەما)

لە بەختی خۆم وڕمام و لە بانگم دا خوایە ئەو خۆشییە لە کوێوەیە؟ دانیشت و دەستی بە گلەییان کرد و گوتی: "کاتێ کە منت دیت بۆ چرایەکەت کوژاندەوە؟ گوتم: "لەبەر دوو هۆ یەکەم پێم وابوو هەتاو هەڵاتووە و ئەوەی تریش ئەم چەند دێرەم بەدڵدا تێپەڕی":

پارچە

کە ناشیرینێک، هاتە پێش چرا

هەستە بیهێنە، دەر لە کۆمەڵا

گەر شەکەر خەندە و شیرین لێوێک بوو
قــــۆڵی بەرمــــەدە، پف کــــە لە چرا

٨- سەرگوزەشتە
یەکێک کە زۆر دەمێک بوو خۆشەویستەکەی نەیدیبوو لێی پرسی: "لە کوێ بووی، زۆرم بیر دەکردی"، گوتی: "زۆربیرکردن چاترە لە بێزاری"

هەڵبەست
درەنگ هاتی ئەی، نیگاری سەرمەست
وا زوو دامــــەنت، بەرنادەم لە دەست
دڵبــــەر کــــە درەنگ، درەنگ ئەیبــینی
هەر بۆ ئەوەیە، کــــە تێــر بیــبــینی

وتەی خۆش
دولبەرێ کە لەگەڵ هاوالاندا هاتبێ بۆ ئازاردان و ستەم هاتووە، لەبەرئەوەی لە ئیرەیی و دوژمنایەتییە خاڵی نییە.

هۆنراو
(لەگــەڵ ئاوالان کــە هاتی بۆ لام، ســەرم لێ بدەی
ئەگەر بەناوی ئاشتیشەوە بێ، تۆ هەر شەڕکەری)

پارچە
کــــە پشــــوێوکی دا، یار لەگــــەڵ ئەغــــیــــار
هێندەی نەمــــابوو، غــــیــــرەت بمکوژێ
بە خەندە گوتی: سەعدی من چرای هەموو جێیەکم
لە پەروانەم چی، کــــە خــــۆی بکوژێ

٩- سەرگوزەشتە

لە یادمە کە لە ڕۆژانی پێشین من و برادەرێکم کە هێندەمان یەکتر خۆش دەویست، وەکوو دوو دەنکە بادامی ناو توێکڵێک وابووین، لە پڕ دابڕانێک و لێک دوورکەوتنەوەیەک کەوتە نێوانیەوە، بەڵام پاش ماوەیەکی کورت کە دۆستەکەم هاتەوە، دەستی بە گلەیی و گازەندان کرد کە بۆ لەو ماوەیەدا تەتەرێکم نەناردووەتە لای، وەڵامم دایەوە: "بەلامەوە ناخۆش بوو، چاوی تەتەر بە جوانی ڕووی تۆ ڕووناک بێتەوە و منیش بێبەش بم".

پارچە

یاری بێرینە، مەمکە نەسیحەت
کە تۆبە ناکەم، بەزەبری شمشێر
پێم ناخۆشە کەس، تێر تەماشات کا
کەچی هەر دەشڵێم، کەس لێت نابێ تێر

١٠- سەرگوزەشتە

زانایەکم دیت، کەوتبووە داوی خۆشەویستی یەکێکەوە، بەڵام پەردەی ڕاز و نهێنییەکەی دڕابوو و ئاشکرا بووبوو، زۆری جەور و جەفا کێشا و زۆری خۆ گرت، جارێکیان بەلای دڵنەوایی و دڵسۆزییەوە پێم گوت: "ئەزانم کە لە خۆشەویستیی ئەم دولبەرەدا هیچ هەوایەکی نەفسیت نییە و دووری لە هەڵخلیسکان جا بۆیە دەڵێم لە زانایان ناوەشێتەوە خۆیان بەدناو بکەن و جەور و جەفاو ئازاری بێ ئەدەبان بکێشن. گوتی: "ئەی یار دەستی گلەییت لە دامەنی ڕۆژگاری من بەردە، بۆ خۆم زۆر جاران لەو بارەوەی کە تۆ لێی دەدوێی، ورد بوومەتەوە، بەڵام من خۆڕاگرتنم پێ ساناترە لە نەدیتنی، دانایان گوتوویانە، دڵ ئازاری و جەوروجەفا کێشان ساناترە، تا چاو لە دیتنی خۆشەویست وەربگێڕی".

هەڵبەست

ئەو كـــەســــەی دڵی، بە دولبـــەر داوە
ڕیشـی لە دەســــــتی، یـەكێ تـر نـاوە

ئاسكێ قـــەرێتـــەی، لە گـــەردەن بكرێ
ناتوانێ ڕێی خـۆی، ســـەربەخـۆ بگرێ

كـــاتێ نـاتوانێ، بێ ئەو بەســـــەر بات
مـەگەر جـەفـاكـا و هەڵی گرێ و دەربات

ڕۆژێ لە دەستی پێم گـوت وای زینهـار
ئای چەند لەو ڕۆژە، كەوتمە ئیستیغفار

دۆست لە دەست دۆستی، ناكەوتە ئامان
بۆ هەر چییەكی بوو، دامنا دڵ و گـیـان

ئەگـــــەر بەلوتفم، لەلای خــــۆی دانێ
یاخـــۆ دەرم كـــا، هەر خـــۆی ئەیزانێ

١١- سەرگوزەشتە

لە هـەرەتی لاوەتـیـیـەدا، كـە زۆر جـاران وا ڕێك ئەكـەوێ و ئەیزانی، من لە نـاخی دڵمــــەوە حـــەزم لـە لاوێك بوو و خـــۆشـم دەویست، چونكە دەنگێكی خـــۆش و سروشتێكی جوانی وەك مانگی چواردەی هەبوو.

خانە

سـەوزەی كەناری ڕوومـەتی، ئاوی حـەیات ئەخواتەوە
با سـەیری شەكرە لێوی كا، ئەوەی نەبات ئەخواتەوە

وارێك كەوت بە پێچـەوانەی شـەقڵی خـۆیەوە، جووڵانەوەیەكی ناسروشـتـیم لێ دیت، پەسندم نـەكـرد، داوێنی خـۆ لێ دوور خـــســتنـەوێم لێ هـەڵكرد و لێی دوور كەوتمەوە، مۆرەی میهر و خۆشەویستییەكەیم كۆ كردەوە و گوتم:

خانه

برۆ بە ڕێگای، ئارەزووی خـــــۆتا

حەز بە مە[1] ناکەی، لە غەمی خۆتا

گوێم لێ بوو، کە دوور کەوتەوە، ئەیگوت:

خانه

شەمشەمە کوێرە گەر نەیویست بگا بە ڕووناکی خۆر

ئەوە بازاڕی خـــۆری پێ ناشکێ هەرگیـــز کـەم و زۆر

ئەوەی گوت و لێیدا ڕۆیی و چووە سەفەرێ و پەریشانی کاری تێ کردم

هۆنراو

(سەردەمی وەسڵم لە دەست چوو، پیاو نەزانە ئەو دەمە

قەدری خۆشی لانییە، پێش وەی بەڵای بۆ بێتە خوار)

خانه

وەرەوە و بمکوژە، کــە لە پێش تۆدا مــــردن

خۆشتـرە، نەک دوای تۆ، ژیان بەســەربردن

بەڵام ســوپاس بۆ گەورەیی خـوا، دوای مـاوەیەک کە گەڕایەوە گەروە داووێنییەکەی گۆڕابوو و جوانییە یوسف ئاساکەی زیانی هێنابوو، سێوی چەناگەی وەک بەهێی زەرد تۆزی لێ نیشتبوو، بازاڕی جارانی جوانییەکەی شکابوو، ویستی لە باوەشێی بگرم، لە تەنیشت خۆمەوەم دانا و گوتم:

پارچه

ئەو ڕۆژەی هەتبوو، جوانی و دولبەری

دڵدادەکەی خۆت، دوور ئەخستەوە

---

١. مە: ئێمە

ئەمرۆکەش هاتووی، ئاشتی کەیتەوە
کـــە ســـــەر و بۆرت، نـا بـە رووتـەوە

## دوو تاکی

بـەهـارت رۆیـی، وا رەنـگت زەرد بـوو
ئاگری ئێمـەش، دامرکا و سـەرد بوو

ئەنازی و لـەنجـــەولار ئـەکـــەی؟
یادی دارایی، ســالّی پار ئـەکـــەی

برۆ لای کـــەسێ، کـــە کـــڕیارتە
ناز لەســـەر وەی کـــە، داواکـــارتە

## خانە

گـوتـراوە سـەوزە لە بـاغـان خـۆشـە
کـــەسێ ئەزانێ، ئـەمـــەی دێتــە زار

یانێ خـەتی سـەوز، لە ڕووی جـوانان
لە دڵی عـاشـقـان، زۆرتر ئـەکـا کـار

بەڵام بـاغـی تـۆ، ســـــۆتکە زارێکە
زیـاتـر دێتــــــەوە، تـا بیکـەی بـژار

## پارچە

ریش بهـــێـــڵـــیـــەوە، یا نەی هێـــڵـــیـــەوە
ئەم ڕۆژە خــــــۆشـــــەی، لاویت هـەر ئەڕوا
گـــەر توانای دەســـتی، تۆم بـا لەســـەر ڕیش
نەمدەهێشت ڕیشت، تاکو قیامەت بێتەوە هەڕوا.

پارچە

پرسـیم و گـوتم، جـوانی ڕووی تۆ چی لێ هـاتووە
مـێـرووله دەوری مـانگی ئاسـمـانێ گـرد و جـۆشـیـوە
جـوابـی دایـەوە، نـازانم لـە ڕووی مـن چـی ڕووی داوە
دیارە هەر لەبەر پرسەی جوانیمە، کە ئەویش ئاوا ڕەشی پۆشیوە

١٢- سەرگوزەشتە

لە یەکێ لە موستەعرەبانم پرسی: "لەبارەی لووسکە و پووسکان چ دەڵێی؟ گوتی: "باشیان نییە، چونکە تا جوان و ناسکن زویرن، کە ناشیرینیش بوون نەرمونیانن"

پارچە

لووسکە ئەو دەمەی، جـوان و شیـرینە
گفـتوگـۆی تاڵ و خـووی توندی هەیە
کـە ڕیشی هات و کـەوتە نێـو سـاڵانە
دەمـودووی نەرم و دڵبـەندیی هەیە

١٣- سەرگوزەشتە

لە زانایەکیان پرسی، گریمان یەکێک لەگەڵ ڕوومانگێکی لە ژوورێکی تایبەتی دەرک داخراودا دانیشێ و کەسیش بە ئاگا نییە و هەموو نووستوون، نەفس داوا دەکات و هەوەس زاڵ، هەروەکو عەرەب ئەڵێت: (خورما گەیشتوو و بێ پاسەوان و بێ پەرژین) هیچ شتێک دەبێتە لەمپەر پیاوەکە بە ساغی لێی دەرچێت؟ وەڵامی دایەوە: "ئەگەر لە مانگ ڕوویانیش بە سەلامەتی دەرچێت لە زاری بەدگۆیان بە ساغی دەرناچێت"

هۆنراو

(پیاو گەر لە خراپەکاری نەفسی خۆی ڕزگاریشی بێ
لە گـومـانی خـراپی دوژمنەکـانی، هەر نابێ دەرباز)

خانە

ئەکرێ ئیشی خۆت، واز لێ بهێنی
ئەی قسەی خەڵکی چۆن، بە کۆتا دێنی

١٤- سەرگوزەشتە

تووتییەکیان لەگەڵ قەلێکدا لە قەفەزێ کرد، لە سەیرکردنی دیمەنی ناشیرینی تووڕە بووبوو و گوتی: "ئەمە چ سەر و ڕوویەکی ناشیرینە و چ دیمەنێکی قیناوییە و چ وێنەیەکی نەفریناوی و ڕەوشتێکی نالەبارە؟ ئۆھ قەلەی ڕووڕەشی نێوانبڕ، خۆزیا دووری نێوانمان ڕۆژھەڵات و ڕۆژئاوا بووایە!"

پارچە

سەر لە بەیانی بەرامبەر بە تۆ، کێ لە خەو ھەستێ
لەگەڵ بەیانا خۆشی ڕۆژەکەی، لێ دەبێ بەشەو

یەکێکی وەکو خۆت ئێسک گران، بکە ھاوشانێ
بەڵام کەسێکی وەک خۆت ناشیرین، لە دنیا کوانێ

سەیرەکە ئەمە بوو کە قەلیش لە ھاوسێیەتی تووتی، لە گیان بێزار بووبوو و دامابوو و بە لاحەولە وەلا گوتنەوە داد و بڕۆی بوو لە دەست چەرخی گەردوون و ھەر ئەینالاند و دەستی پەرۆشییەی پێکدا دەدا و دەیگوت: "ئەمە چ بەدبەختی و ناوچەوان و ئیقباڵێکە و چ سەرەنجامێکی کەم و کاتی و ڕەنگاڵەیە؟ ئەمە بوو پلە و پایە و قەدری من؟ یان دەبووایە لەگەڵ قەلێکی تر لەسەر دیواری باغێک، کەشان کەشان پێکەوە بخولابایینەوە.

خانە

بۆ چاکان بەسە، ئەوەندە زیندان
لە تەویلێکدا، بێ لەگەڵ ڕەندان

چ تاوانێکم کردووە کە ژیانم لە سزای ئەمەدا کەوتە دۆستایەتییەکی ئاوای لە خۆ ڕازی و نالەبار و کەودەنەوە.

پارچە

کەس نێزیک نابێ، لەو بن دیوارەی
وێنەی تۆی لەسەر، کە نیگار ئەکەن
ئەگەر جێگای تۆ، لە بەهەشتا بێ
خەڵکی دی دۆزەخ، ئیختیار ئەکەن

ئەم پەندەشم بۆیە بە نموونە هێنایەوە هەتا بزانی کە دانایان چەندیان قین لە نادانایانە، نادانایانیش هێندەیان ڕق لە دانایانە.

پارچە

زاهیدێک لەناو گەڕی ڕەندان بوو
لەو ناوە گوتی، جوانێکی بەڵخی[1]
گەر بێزاریشی، ڕووترش مەبە
دەنا لە ناومان، تاڵ و بێ نرخی

چوارینە

کۆمەڵێک وەک گوڵ و لالە، بەیەک پەیوەستە
تۆش داری وشکی ڕواوی، لە ناویان ئێستە
وەکو بای ڕەشەبا و وەک سەرمای ناخۆش
وەک بەفری کەوتوو و وەک شەختەی بەستە

١٥- سەرگوزەشتە

برادەرێکم هەبوو، کە ساڵەها پێکەوە سەفەرمان کردبوو و نمەکی یەکتریمان کردبوو و دۆستی گیانی بە گیانی یەکتری بووین، تاکو لەبەر سوود و قازانجێکی کەم، دڵی ڕەنجاندم، دۆستایەتییەکەمان ساردی تێ کەوت، لەگەڵ ئەوەشدا هەردوو لامان، دڵمان بۆ یەکتری لێی دەدا، بەهۆی ئەوەوەش کە بیستم ڕۆژێک دوو دێری خوارەوەی لە هەڵبەستەکانی من لەناو کۆمەڵێکدا خوێندبوووەوە.

---

١. بەڵخی: خەڵکی شاری بەڵخ

## پارچە

دولبـــەرم کـــە هـاتە ژوور، بە پێکەنینێکی خـــۆش
خـوێ زیاتر ئەکـا بەسـەر، زامی کـولی پڕ هێـشـان
چی ئەبوو ســـەری زولفی، بکەوتبـایە دەســـتی من
وەک مـەچەکی پیاوچاکان، لە دەست دەستی دەروێشان

هێندێک لە دۆستان نەک هەر لەبەر جوانیی شیعرەکان، بەڵکە لەبەر جوانیی خوو و ڕەوشتی خۆم گەواهییان دابوو و پەسندیان کردبوو هەروەها ئەو دۆستەش لە ناو کۆمەڵەکەدا بەشە ستایش و پێدا هەڵگوتنی خۆی خستبووە سەرێ، زۆری غـەمی دۆسـتایەتیی کـۆنمانی خـواردبوو و پێی لە هەڵەی خـۆی نابوو، بەم جـۆرە ئاشکرا بوو کـە حـەزی لە ئاشـتـبـوونەوەیە، بە گـوێرەی ئەمـە ئەم چەند دێرە شیعرانەی خوارەوەم ناردن و ئاشت بووینەوە.

## پارچە

هیچ ناخۆشییەکمان، لە بەینێ نەبوو
دڵ ڕەقـیت کـرد و دژایەتیت کـرد دیار
دڵم دا بە تۆ و گـــوێم نەدایە کـــەس
نەمـــزانی وا زوو، بەجـــێم دێڵی یار!
ئێستاش گەر ئاشتیت، دەوێ بێرەوە
خۆشـەویستتری، لە جاران چەند جار

پیاوێک ژنە جوانە شۆخ و شەنگەکەی مرد، دایکە پیرە پەڕپووتەکەی ژنەکەی، لە ماڵەکەدا مایەوە، پیاوەکە لە هاودەمی پیرێژنەکە بێزار و لەقسە لەگەڵ کردنیدا جاڕس بوو، هەتا کۆمەڵێک لە ئاشنایانی بۆ پرسە هاتنە لای، یەکێک لەوان لێی پرسی:

لە دووری و لێکدابڕانی خۆشەویستەکەت چۆنی؟ وەڵامی دایەوە:

"نەدیتنی ژنێ هێندەی دیتنی دایکی ژنێ دژوار و گران و ناخۆش نییە".

هەڵبەست

گــــوڵ بە تاڵان چوو، درک مــــایەوە
گـەنجـیـان هەڵگرت، مـار جێ مـایەوە

چاو لەســــەر نووکی، نێــزە ببـــینی
چاترە لەوەی، دوژمنەکانتی کە پێ ببینی

لە هـەزار دۆســـــتـــان دەبێ وازبێنی
تـا دوژمـنـێـکـت بـە چـاو نـەبـیـنـی

١٧- سەرگوزەشتە

لە یادمە لە سەردەمی لاویمدا لە ڕۆژێکی گەرمای تەمووزدا بەشەقامێکدا تێ پەڕیم کە دەمەویست مانگ ڕوویەکی ببینم، بەلام گەرما چ گەرما تفی لە زاردا وشک دەکردەوە و وڕەی گەرماکەی مۆخی ناو هێسکی ئەکولاند، بەهۆی بێ هێزی مرۆڤی بوونمەوە، نەم ئەتوانی خۆم لەبەر تینی هەڵپڕووکێنی هەتاوێ ڕابگرم.

خۆم خزاندە پەنا دیوارێکەوە، بە هیوای ئەوەی یەکێکم لە هانا بێت و لەو گەرمای هاوینەم قوتار کات و بمحەسێنێتەوە و گڕی تینووەتیم بە قومێک ئاو دامرکێنێ و لە ناکاو سەیرم کرد لە تاریکی دالانی ماڵێکیدا چرایەک هەڵکرا، یانی جوانێک کە زمان لە باسی جوانی ئەودا لاڵە، هەروەکو سپێدەی پاش شەوە زەنگێک یان وەک ســــەرچاوەیەکی ئاوی حــەیات کــە لە ئەشکەوتێکی تاریک و نووتەکدا هاژە بکات و سەرەو ژێر بێ، هاتە دەر، جامە بەفراوێک بە دەستــەوە، شەکری تێ کردووە و گولاوی لێ پژاندووە، جا نازانم ئاوەکەی بە گولاوێ بۆن خۆش کردبوو یا چەند دڵۆپە ئارەقێکی ڕووی گوڵینی تکاوەتە ناو ئاوەکەوە.

بە کورتی ئاوەکەم لە دەست و پەنجە جوانەکەی وەرگرت و خواردمەوە و دووبارە ژیانم وەبەر هاتەوە.

هۆنراو

تینوویەتی دڵم، بە هیچ ناشکێ
با بشخۆمەوە، ئاوی دەریایان

پارچە

خۆشی لەو کەسەی کە هەردوو چاوی
ئەبینێ ڕووی وا، سەرلەبەیانی
مەستی مەی، بێدار ئەبێ نیوەشەو
مەستی ساقی، حەشر سەرلەبەیانی

١٨- سەرگوزەشتە

ئەو ساڵەی کە (محەمەد خوارەزم شا)[١]- رەحمەتی خوای لێ بێ - بۆ نیازێکی خۆی لەگەڵ پاشای (خەتا)[٢]یە ئاشت بووەوە، چوومە مزگەوتی گەورەی (کاشغەر)[٣] و کوڕێکی یەکجار ناسک و جوانم چاو پێ کەوت، کە هەروەکو لە سەرگوزەشتاندا باسیان دەکەن.

---

١. محەمەد خوارەزم شا: ناوی (عەلائەددین محەممەد) کوڕی (تەکش) ە یەک لە سوڵتانەکانی خوارەزمە لە ساڵی ٥٩٦ی کۆچیدا هاتە سەر تەخت، پاش ماوەیەکی کەم (سەمەرقەند) و (غەزنە) و چەند جێیەکی تریشی گرت. ملی بە ئەتابەگی ئازربایجانی کەچ کرد. (ئەبوبەکری سەعدی) بە دیل گرت، لە ساڵی ٦١٥ی کۆچیدا چوو سەر بەخەلیفەی بەغدایە شۆڕ کا، بەڵام لەڕێگادا بیستی کە (مەغۆل) بۆ لای (ما وراء النهرین) تێ کشیون، گەڕایەوە خوارەزم. دوای چەندین شەڕو شۆڕی خوێناوی لەگەڵ (مەغۆلەکان) دا لە ساڵی ٦١٦ کۆچیدا تێکشکا و هاڕدرا، دوای ساڵێک سەرگەردانی ئەوجا مرد.

٢. خەتا: چینی باکور.

٣. کاشغەر: شارێکی تورکستانی چینییە.

هەڵبەست

ئەو هەموو شۆخی و دوڵبەرییە، لە مامۆستا فێر بوو
جەفا و ناز و گلەیی و ستەمکاری وا فێر بوو
کەسم بەو جۆرە وێنە و ڕەوشت و باڵا و خووە...
نەدیوە، مەگەر ئەم شێوە، لە ناو پەرییاندا فێربوو

دێباچەکەی "زەمەخشەری" لە ڕێزمانی عەرەبیدا، بەدەستەوە بوو و ئەیخوێندەوە (ضرب زید عمروا) یانی زەید لە عەمری دا گوتم:

"کوڕە! خوارەزم و خەتا ئاشت بوونەوە، کەچی زەید و عەمرو هێشتا هەر شەڕیانە؟" پێ کەنی و لە زێدمی پرسی، وەڵامم دایەوە:

"خاکی پاکی شیراز" کوڕە گوتی: "لە قسەکانی سەعدی چ دەزانی و چیت پێیە؟" گوتم:

هۆنراو

(تووشی نەحوییەک بووم، هێرشی بۆ هێنام
هەروەکو زەید، بۆ سەر عەمری
لەبەر جەڕەی کلک، سەر بەرزۆ ناکا
چۆن رەفعە لەبەر، جەڕە خۆی ئەگری)

کەمێک داما و پاشان گوتی: بەشی زۆری هۆنراوەکانی "سەعدی" لەم سەر زەمینەدا، بە زمانی فارسییە، ئەگەر هەر بە فارسی بیڵێی بۆ تێگەیشتنێ نزیک و ئاسانترە" جا گوتم:

هۆنراو

تا تۆ هەوەست، چووە ڕێزمان
شێوەی ئاقڵیەم، لە دڵدا نەمان
ئەی دڵی عاشقان بە داوی تۆ صەید
ئێمە خەریک تۆین، تۆش بە عەمرو زەید

بەیانییەکەی تر کە نیازی سەفەرم بوو، پێیان گوتبوو کە من (سەعدی) بوویم، بەپاکردنەوە هات و پەرۆشی خۆی زۆر بە شەرمەوە دەربڕی و داخی ئەمەی خوارد کە من بۆ چەند وەختە خۆم ئاشکرا نەکردووە، تا چاکی خزمەتی گەورە پیاوانی لێ کردبایە بەلادا، گوتم:

نیو هۆنراو

لەگەڵ بوونی تۆدا، لە من دەنگ نایە کە منم

هەروەها گوتی: "چ ئەبێ ئەگەر چەند ڕۆژێکان بۆ سانەوە لەم وڵاتەدا بمێنییەوە تا لە خزمەتتدا بەهرەمەند بین. وەڵامم دایەوە: ناتوانم لەبەر ئەم ڕووداوەی خوارەوە".

هەڵبەست

گەورەیەکم دی، لە ناو کۆساری
لە دنیا رازی، بە ژووری غاری
گوتم، بۆ نایەن، سەرێک دەن لە شار
لە دڵی دەرکەن، عەزمی بەندی غار
گوتی: "ڕووپەری زۆری لێن، بڵاو
کە قوڕ زۆر بوو، فیل ئەخلیسکێتە ناو

ئەوەم گوت و سەر و ڕووی یەکتریمان ماچ کردو خوا حافیزیمان لە یەکتری کرد.

دوو تاکی

ڕووی دۆست ماچکردن، کەڵکی چییە بۆی؟
هەر لەو کاتیشدا، بخوازی و بڕۆی
سێو دوعاخوازی، لە یارانی کرد
بۆیە لایەکی سوورە و لایەک زەرد

هۆنراو

(گەر لە رۆژی لێکدابڕان، نەمرم لە غەمان
بەڕاستم مەگرن لە وەفای دۆستان)

١٩- سەرگوزەشتە

خەرقە پۆشێک لە کاروانێکی حیجازدا، هاوڕێی ئێمە بوو و یەکێک لە ئەمیرە عەرەبەکان سەد دیناری دایە بیکاتە قوربانی جەردەو ڕێگری تیرەی (خەفاجە)[١] لە ناکاو لە کاروانەکەیان دا و لووس بردیان بازرگانەکان بە جارێک دەستیان بەگریان و زاری و هاتوهاوارێ کرد.

هۆنراو

بناورێیەوە، یا بکەی هاوار
دز ناداتەوە، زێڕ سا بە هیچ بار

مام دەروێش کە هەر لەسەرباری هێوریی خۆی مابووەوە و نەگۆڕابوو لێم پرسی، ئەڵێی جەردەکان پارەکەی تۆیان نەبردووە؟ وەڵامی دایەوە: با، بردیان بەڵام من هێندەم ئۆگری پێوە نەگرتبوو، کە لە کاتی لێکدابڕانێدا بۆی بە پەرۆش بم و لە تاوانی نەخۆش کەوم.

خانە

بەهیچ و بەکەس، مەبەستەوە دڵ
دڵ هێنانەوە، کارێکە موشکیل

وەڵامم دایەوە، ئەوەی کە تۆ گوتت ڕاست بە حاڵی من ئەچێ، کاتێ کە لاو بووم، لەگەڵ دۆستێکی گیانیی لاودا بووم و خۆشەویستییە ڕاستەقینەکەمان بە ئەندازەیەک گەیشت، کە جوانی ئەوم لەلا ڕووگەی چاوان بوو و گەورەترین خۆشیی ژینم دیتنی ئەو بوو.

---

١. خەفاجە: تیرەی بەنی عامیرە

پارچە

ڕەنگە فریشتەیەکی ئاسمان، نەکو بەشەر
بە دیمەنی جوانیەوە ئەوی، لەسەر زەوی دانابێ
سوێند بەو دۆستە کە لە پاش، ئەو دۆستی حەرامە
تۆخمی ئادەمییەکی دیکەی، وەک تۆ لێ پەیا نابێ

لە ناکاوا پێی بوونی بە ناخی گڵی نەبوونا ڕۆچوو و دووکەڵی جیابوونەوە و لێکدابڕانی، لە قووڵایی هەناوییەوە سەری کرد. ڕۆژەها لەسەر خاکی گۆڕەکەی دانیشتم و بەردەوام ئەو دوو دێڕەی کە لە دابڕانی ئەودا دەمگوتنەوە ئەمانە بوون:

پارچە

خۆزگە ئەو ڕۆژەی کە دڕکی ئەجەل، بە ژێر پێتا چوو
دەستی ئاسمان زوو، شیرێکی لەسەر سەری من دابا
تا چاوم بێی تۆ ئا لەم ڕۆژەدا، دنیای نەدیبا
ئەوە منم وام لەسەر گۆڕەکەت؟ بریا سەری منی ها لەبندابا

پارچە

ئەوەی کە نەیبوو، هیچ ئارام و خەو
تا گوڵ و نەسرینی، نەپژاندایە شەو

وا دەستی گەردوون، گوڵی ڕووی وەراند
لەسەر گۆڕەکەی، ئەو دڕکی ڕوواند

دوای لێکدابڕان و جیابوونەوەم لەو، هاتمە سەر ئەوەی کە ئیتر پاشماوەی ئەوەندە ژیانەی کە ماوە، ئیدی گلیمی خۆشی و ئارەزووەکانم لە هیچ کۆڕو دانیشتنێکاندا ڕانەیەخەمەوە و نزیکی کەس نەکەومەوە.

پارچە

سـوودی دەریا خـۆش دەبوو، گـەر ترسی شـەپۆلان نەبا
هاودەمـیی گـوڵ خـۆش دەبوو، گـەر ئازاری نەبا خـار

دوێ شـەو وەک تاوس لە باغـا، بووم و من نازم دەکـرد
وا کـەچی ئیـمڕۆ لە دووری یار، پێچ ئەخۆم هەروەکو مار

٢٠- سەرگوزەشتە

سـەربردەی "لەیلا و مـەجنوون" و شـۆڕ و شێوەی ئەوەیان بە پاشـایەکی عـەرەب گوت، کە مـەجنوون لەگەڵ ئەو هەمـوو زانیـاری و ڕەوانبێژی و زمـانە شیـرینەیدا ئەوەتا ملی لە بیـابانێ ناوە و چۆڵگەردییـە دەکـا و جڵـەوی دەسـتـەڵاتی خۆی لە دەست داوە.

فەرمانی دا هێنایانە بەردەمی، دەستی کرد بە سەرزەنشت و سەرکۆنەکردنی و لێی پرسی: "چ کەموکووڕی و چ کەمایەسییەکت لە گەورەیی گیانی مرۆڤایەتیدا دیوە، وا خووت بە جرووجانەوەر و دڕندەی کێوانەوە گرتووە و وازت لە هاودەمی و دانیشتنی نێو پیاوان هێناوە؟"

"مەجنوون" وەڵامی دایەوە:

هۆنراو

(ئاوەڵان لۆمـەم دەکـەن، بۆچی بوومـە وێڵگەردی
کە ڕۆژی رووی ئەوتان دیت، تێدەگەن بۆ چی شێتم)

پارچە

کـــاشکی ئـەوانـەی، پـلاریـان داویشـت
ئەی یار! چـاوێکیـــان لە رووی تۆ ئەبڕی

تـاکـــو لـە بـاتـی لیـــمـــۆ، لـە رووتـا
واقـیـان وڕ ئـەمـا و دەست خـۆیان ئەبڕی

بۆ ئەوەی راستی قسەکەشم دەرکەوتایە (فذلك الذي لمتنني فيه) ئەوەتا ئەوەی تانووتتان پێوە لێ ئەدام.

پاشا بە دڵیدا هات کە جوانیی "لەیلا" ببینێ و بزانێ چۆنە کە ئاوا بووەتە مایەی ئەو بەڵا و فیتنەیە؟ فەرمووی بە دوایدا بگەڕێن، زۆر هەوار و جێ هۆبەی عەرەبان گەڕان تا دۆزییانەوە و هێنایانە لای پاشا و ئەویش لە شێوە و ڕەنگ و ڕووی و دیمەنی دیاری ورد بووەوە و زۆر بێ بەها و بە کەمی هاتە بەرچاو، چونکە کەمترین کارەکەر و قەرەواشەکانی ناو ماڵیی لەو جوانتر و سەرنج ڕاکێشترن. مەجنوون بە بلیمەتی خۆی تێگەیشت و گوتی: "دەبێ لە کلاو ڕۆژنەی چاوی مەجنوونەوە بنوارییە جوانیی لەیلایە" تاکو نهێنی جوانی ئەوت بۆ دەرکەوێ.

هۆنراو

گەر ئەو باسەی مێرغوزار، کە چۆتە ناو گوێیانم
گەڵای داران بیستبای، دەبوونە هاو گریانم

ئادەی کۆمەڵی یاران، بڵێن بەم بێ ئاگایە
تا تێ بگا چی تیایە، ئەو دڵەی پڕ لە ژانم

پارچە

ئەوەی کە ساغە، ئازاری نییە
من ئازاری خۆم، ئەڵێمە هاو ئێش

باسی مێش هەنگوین، بۆ کەسێ نابێ
کە لە تەمەنیا، لێی نەدیبێ نێش [1]

تا حاڵت وەکو، حاڵی من نەبێ
حاڵمت هەروەکو، داستان دێتە پێش.

٢١- سەرگوزەشتە

دەگێڕنەوە، قازیی "هەمەدان" بە خۆشەویستی کوڕێکی زۆر جوانی ناڵبەندەوە

---

١. نێش: پێوەدان.

سەرخۆش بوو و نالّی دڵی هەمیشە لە نێو نێڵەی ئاگریدا دەتوایەوە و هەمیشە لە ئارەزووی دیداری ئەودا چاوەڕوان بە دوایەوە و بەگوێرەی حاڵی خۆی دەیگوت:

چوارینە

چاوم کەوت بەو سەرووەی، ڕاست و جوان و بوڵەند
دڵی لە دەست فڕاندم، خستمی بێ چوون و چەند

ئەوچاوە مەستانەی تۆ، دڵیان بردم بە کەمەند
گەر دەتەوێ دڵ بەکەس، نەدەی چاوت بکە بەند

بیستم کە کوڕە، لە کۆڵانەیەکدا تووشی قازی بوو و هێندەی لەو قسانەش بیستبووەوە و بە ئەندازەیەک ڕقی هەستابوو مەپرسە، بە جنێودانێکی بێ پەروایانەوە هەڵمەتی بۆ سەر قازی هێنا و ئەوەی بێ ڕێزییە نەما پێی نەکا و بەردێکیشی لێ تاودایە، قازی بە یەکێک لە هاودەمە زانایەکانی خۆی گوت کە لەگەڵیان بوو.

خانە

ئا ئەو دولبەرە جوانە و تووڕەبوونی ببینە
گرێی گرژی سەر ئەبرۆی چەندە جوان و شیرینە

عەرەب ئەڵێن، (ضرب الحبیب زبیب) واتە: لێدانی خۆشەویست مێوژە – وەک مێوژ شیرینە –.

خانە

لە دەستی تۆوە مستێ لە دەم دان
خۆشترە لە خواردنی بە دەستی خۆم نان

هەروەهاش لە بێ شەرمییەکەی بۆنی لێبووردن دەهات هەر بەم ڕێیە، بێ شەرمیی کوڕەکە، نیشانەی دڵسۆزی ئەدا. هەروەک پاشایان، گوتەی دژواریان بە زاردا دێت و بێوەش، ئارەزووی ئاشتی دەکەن.

ترێی تازە نەگەیو، هێشتاکە تامی ترشە
دوو سێ رۆژ چاوەڕێ بە، شیرین ئەبێت و خۆشە

قازی ئەوەی گوت و هاتەوە سەر کورسیی دادوەرییەکەی، چەند پیاوی گەورەی لە ئەنجوومەنی دادگادا لەگەڵدا بوون و خاکی بەرپێیان ماچ کرد و گوتیان: "ئەگەر مۆڵەت بفەرمووێ چەند قسەیەک لە خزمەتیا بکەن، هەرچەندەش بێ ئەدەبییە و دوور لە خوو و خدە و ڕەوشتیشە، چونکە گەورەکان فەرموویانە:

خانە

قسە لە هەموو باسێک، نارەوایە
هەڵە لە گەوران گرتن، خەتایە

بەڵام لەبەر ئەو هەموو چاکە و بەخششانەی گەورەییتان کە بە بەردەستانی خۆتانتان بەخشیوە، ئەگەر کارێکی چاکەیان دیت و نەیڵێن ناپاکییە و خیانەت. جا ڕێگای ڕاست و دروست ئەوەیە کە ڕادەستی حەز و ئارەزوو و ویستەکانی خۆت نەبی و گلیمی هەوەس و حەزەکانتی لەگەڵ ڕانەخەیت و توخنی نەکەوی، چونکە پلە و پایەی دادوەری مەقامێکی بەرز و پتەوە و تاوانی ناشیرینی تێ هەڵ مەسوو و دۆستەکەت ئەوە بوو کە دیتت و قسەی ئەوە بوو کە بیستت!"

دوو تاکی

یەکێ کردبێتی بێ ئابڕوویی زۆر
گوێ بە ئابڕووی کەس، نادا کەم و زۆر

زۆر ناوی پاکی، تەمەن پەنجا ساڵ
بە بەدناوییەک، بووە پایەماڵ

قازی یەکسەر ئامۆژگاریی برادەرانی لە ناخی دڵیەوە پەسند کرد، ئافەرینی هەست و بیر و لێکدانەوەی کردن و گوتی: سەرنجی خۆشەویستان لە کاروبارەکانی مندا زۆر ڕاستە و وتارێکی بێ وەڵامە، بەڵام.

خانه

چەندی دەتوانی، ئامـۆژگـاریم کـە
سـا وەرە رەشی لە زەنگی وەکـە

یەک تاکی

هەرگـیز یادی تۆم بیـرناچێ بە هـیچ
مـاری کـوژراوم، ئەدەم لوول و پیـچ

ئەمـەی گـوت و چەند کـەسێکی بە دوادا نارد و پارەوپوول و زێڕێکی زۆری دایە گوتوویانە: هەرکەسێکی زێڕی زۆری لە تەرازووە، هێزی زۆری لە بازووە.

هەڵبەست

ئەوەی زێڕی دیت سـەر نەوی ئەکـا
وەکـو تەرازووی ئاسـنین شـان بێت

بەکورتی شـەوێکی بۆ هەڵکەوت لەگـەڵ کـوڕەدا، هەر ئەوشـەوە داروغـەی شـار پێیان زانی کە قازی خۆشەویستەکەی لەباوەشێیە و جامی مەی بە دەستەوەیە و لە خۆشییا ناخەوێ و هەروا گۆرانی ئەڵێ.

هەڵبەست

دەڵێی ئەمـشـەو لەکـاتی خـۆی، بانگ نادا کـەڵەشـێـر
چوون دڵداران لە مـاچ و مـووچ و باوەش یەک، نەبوون تێر

زینـهـار تا چاوی فـیـتنە نووسـتـووە و لە خـەودایە
وریابە نەڕوا ژیان بە فـیـڕۆ و و بەبێ خـێـر

تا لە مـزگـەوتی جـومـعـەوە، بانگی بەیانی نەبیـیـەی
یا لە پێش مـاڵی (ئەتابەگ) دەهـۆڵی دەنـگ نێـر

لێـو لەسـەر لێـوبی، وەک پێـلـووی چاوی کـەڵەشـێـرێ
لێک هەڵنەبڕێی بەدەنگی، بانگی کـەوجی کـەڵەشـێـر

قازی لەو حاڵەدا بوو کە یەکێک لە بەردەستەکانی هاتە ژوورێ و گوتی:

"ئەوە بۆ وا دانیشتووی، هەستە و هەتا پێی ڕاکردنێت هەیە هەڵێ و مەوێستە، حەسوودان بە دژی تۆوە پاڵیان وێک داوە و ڕاستییان گوتووە، تا ئاگری فیتنە کەمە بەڵکە بە ئاوی فێڵێکیەوە دای مرێنییەوە، ئەوەکا سبەینێ کە بەرز بووەوە و هەڵگیرسا دنیایەک وێران کات و بیسووتێنێ.

قازی بە گرژییەکەوە ڕوانی و گوتی:

پارچە

کە شێر چەپۆکی گیر کرد لە نێچیر

چ سوودێک ئەدا، سەگی بێتە نیار

ڕووت لە ڕووی دۆست کە و واز بێنە هەتا

دوژمن پشت دەستی خۆی ئەجوێ بەزار

هەر بەو شەوە پاشایان ئاگادارکرد، کە لە هەرێم و قەڵەمڕەوی تۆدا ناڕەواییەکی بەم جۆرە ڕووی داوە، چی ئەفەرموون؟

پاشا گوتی: "من ئەو بە یەکێک لە هەرە زانایە تاکەکان دەزانم و من وای بۆ دەچم ڕەنگە دوژمنەکانی پیلانیان بۆ نابێتەوە، جا من ئەم قسەیەم ناچێتە گوێوە تا بە چاوی خۆم نەیبینم، کە دانایان گوتوویانە.

خانە

بەرق و چوستی دەست بۆ شیر بردن

پەشیمانییە و پشتە دەست گەستن

بیستم لە بەرەبەیاندا، پاشا لەگەڵ چەند کەسێکی تایبەتیدا گەیشتە سەر سەری قازی، ئەوەی نەشیاوە دیتی، لامپا بە پێوە وەستاوە و دولبەر دانیشتووە و مەی ڕژاوە و پەیمانە شکاوە قازی لە خەوی مەستیدا، لە هەرێمی بوون و هەستیدا بێ ئاگایە. پاشا بە نەرمی و لەسەرەخۆییەکەوە بێداری کردەوە و گوتی: "هەستە ڕۆژ هەڵاتووە"، قازی هەستی کرد وەزعەکە چییە، پرسی: "ڕۆژ لە کام لاوە هەڵاتووە؟"

پاشا سەری سوڕما و وەڵامی دایەوە: "هەروەکو جاران لە ڕۆژهەڵاتەوە". قازی بەهاوارەوە گوتی: "گەورەیی هەر بۆ خوایە! هێشتا دەروازەی پەشیمانییە دانەخراوە و هەر کراوەیە، لەبەرئەوەی فەرموودەی پێغەمبەرە سەلامی خوای لێ بێ – کە فەرموویەتی:

"لاتغلق باب التوبة على العباد حتى تطلع الشمس من مغربها ".

"واتە: دەرگای تۆبە و پەشیمانی لەسەر بەندەکانی خوا داناخرێ تا ڕۆژ لە ڕۆئاواوە هەڵ نەیەت". "أستغفرك اللهم وأتوب اليك": داوای لێ خۆشبوون دەکەم خوایە! پەشیمانی بۆ تۆ ئەبەم، تۆبە.

پارچە

دوو شت ئەمخەنە سەر گوناهکردن
بەختی خراپ و عەقڵی ناتەمام
سزام دەی حەقە، یا عەفووم بکەی
بەخشین چاکترە لە ترس و لە سام

پاشا وەڵامی دایەوە: "هەروەکو ئەزانی، دەبێ سزایەکی هەرە گەورە بچێژی، پەشیمانی سوودی نییە "فلم يك ينفعهم ايمانهم لما رأوا بأسنا" واتە – تازە باوەڕیان چ کەڵکێکیان ناگرێ، کە تۆڵەستاندنەوەی ئێمەیان دیت.

پارچە

سوودی چییە کاتێ، تۆبەکەی لە دزی
نەتوانی کەمەند باوێیە کۆشکان
بە درێژان بڵێی بادەست لە میوە بکێشێتەوە
کە کورت خۆی دەستی ناگاتە لکان

لەبەرئەوەی تۆ ناڕەواییەکی وات کردووە، ڕێی ڕزگارییەت براوە، دوای ئەوەی پاشا ئەم قسانەی بەزاریدا هات، پیاوان دەستنیشان کران تا بە سزای خۆی بگەیەنن، گوتی: لەخزمەت پاشادا وتەیەکم ماوە، پاشا بیستی و پرسی چییە؟ و گوتی:

پارچە

کـە تۆ دەست لە من هـەڵ ئەتەکـێنی
پێت وانەبێ دەست، لە دامـەن بەردەم

گـەر لە گـوناهم چاوپۆشـیش ناکـرێ
بەو رەحمـەی هەتە، ئومێـدمـە هەردەم

پاشـا وەڵامی دایەوە: "ئـەم وردەکاری و ئـەم قسـە نەسـتـەقـەت بێ وێنـەو نایاب بوون، بەڵام پێـچـەوانەی ئەقڵ و هۆش و رێورەسـمە کە زانایی و شـیرین زمانیـتـان ئەورۆ تۆ لە سـزا دەرباز بکات، چونکە فـەرمـانم داوە و وای بە باش دەزانم لە قەڵاتێوە سەرەوژێرت هەڵدەنە خوارێ تا کەسانی تر پەندت لێ وەرگرن.

قازی هەر چیرەی دایە و گوتی: "ئەی خاوەنی جیهان، من پەروەردەی بەخششی ئەم خانەوادەیەم، هەر من بەتەنیا ئەم تاوانەم لە دنیایەدا نەکردووە، پیاوێکی تر لە قەڵاتێوە هەڵدەنە خوارەوە، تا من پەند و ئامۆژگاریی لێ وەرگرم".

پاشا پێکەنین گرتی، لە تاوانەکـەی خۆش بوو و بە وانەی کە بەدوای کـوشـتنی قازییەوە بوون، گوت:

هۆنراو

هەرکـەس هەڵگری عـەیبی خـۆیـەتی
باکـەس تانە لە عـەیبی کـەس نەدا

٢٢- سەرگوزەشتە

هەڵبەست

لاوێـکی داوێـن پـاک و روو جـــوان
لەگـەڵ جـوانێکا بەسـتـبووی پـەیمان

وام خـوێندەوە کـە، لە دەریای گـەورە
پێکەوە کـەوتنە، گـێـژاوی گـەورە

مەلەوان بۆی هات، تا دەستی بگرێ
نەوەک بەدەم ئەم، حاڵەوە بمرێ

گوتی: "لەناوەند شەپۆلی گەورە
لێم گەڕێ و دەستی، یارەکەم بگرە"

کە ئەمەی ئەگوت، مەئیوس بوو لە گیان
لە گیانەلادا، وای ئەکرد بەیان

وتەی خۆشەویستی مەبیە لە بێ ژێر
کە لە تەنگانان، یار ئەکا لە بیر

دڵداران وایان، کورد زیندەگانی
لە لەکارکەوتوو فێربە، تا بزانی

سەعدی ئەزانێ کە عەشقبازی
هەروەکو بەغدا و زمانی تازی[1]

بەو دلارامەی هەتە، دڵ بەستە
ئیتر لە دنیا، هەموویی چاو بەستە

گەر لەیلا و مەجنوون بێنەوە ژیا
لێرە تۆماریان ئەکرد، سەربردیان

---

١. زمانی تازی: زمانی عەرەبی ڕەوان.

دەرگەی شەشەم

# لە بێهێزی و پیری

١- سەرگوزەشتە

لەگەڵ تاقمە خوێندەوارێکدا لە مزگەوتی دیمەشقدا خەریکی باسێکی بووم، لاوێک هات و پرسی: "لەناو ئێمە کەس هەیە زمانی فارسی بزانێ؟ زۆربەیان پەنجەیان بۆ من درێژ کرد. پێم گوت خێرە؟ گوتی: "پیرێکی سەد و پەنجا ساڵە لە سەرەمەرگدایە و بە زمانی فارسی شتێک ئەڵێ و تێی ناگەین و ئەگەر لە ڕێی دڵسۆزییەوە بێیت و تێی بگەی خێرە، لەوانەیە وەسیەتێکی هەبێ، کە چووم و لە سەرینگانێی نزیک بوومەوە، گوتی:

پارچە

کەمێک پێش گوتم، وچان دەم هەندێ

درێغ کە گیرا، لێم ڕێگای نەفەس

درێغ! لە خوانی هەمەڕەنگی ژین

کەمێکمان خوارد و ئیدی گوتیان بەس

مانای ئەو قسانەم بە عەرەبی بە شامییان گوت و پێیان سەیر بوو، کە دوای ئەم هەموو تەمەنە درێژە، هێشتاش هەر چاوی لە دووی ژیانە. لێم پرسی: بەم حاڵەوە داخوا چۆنی؟ گوتی چی بڵێم؟

پارچە

نەتدیوە داخوا کە چ ئازارێ، ئەگا بە کەسێ

کە لە دەمی ئەو کەسەی دەردێنن، بەزۆر ددانی

ئەی دەبێ چۆن بێ، ئەو کـــات و ســـــاتەی
کـە لە بەدەنی دەچێـتـە دەرێ گـیـانـی ڕەوانی

پێم گـوت بیـری مــردنێ لە دڵت دەرکــەو مــەهێـڵــە ترست بەســەردا زاڵ بێ، فەیلەسووفانی یۆنانی گوتوویانە، ئەگەر چی میزاج و تەبیعەت ڕاستیش بێت، جێی بڕوای مانەوە نین و نەخۆشیش ئەگەر چی کوشندەش بێ نیشانەی مردنێ نییە بە تەواوەتی، لێم پرسی:

"ئەگەر ئەفەرمووی پزیشکێکت بۆ بێنم، دەرمانت بکا؟ چاوی هەڵبڕی و پێ کەنی و گوتی

دوو تاکی

دەست لە دەست ئەدا، پزیشکێکی ژیر
کە دی وەک کەندوو، کەوتووە یارۆی پیر

خـواجـە خـەریکی، نەخـشی هەیوانە
کــاتێ کــە خــانوو، کـاول و وێرانـە

پیــرەمــێـردێک گـیــان، ئەداو ئەناڵێ
پیــرێژن مـــووروو، لە لەش ئەمــاڵێ

کـاتێ تەلاری مــیــزاج، کــەوتە ڕمــان
نە نووشـتـە کـەڵکی ئەگـرێ نە دەرمـان

٢- سەرگوزەشتە

وا ئەگێڕنەوە پیرێک کچێکی گەنجی هێنـابوو و، ژووری بەگوڵ بۆ ڕازاندبووەوە و بەتەنیـا لەگەڵیدا دانیـشتـبوو و چاو و دڵی پێـوە بەسـتـبوو و، بە درێژایـی شـەو نەئەنووست و هەر قسەی نەسـتەق و خۆشی بۆ ئەکرد، بەو هیوایەی دەستەمۆ بێت و شەرمی بشکێ، شەوێکیان پێی گوت:

"بەختی بڵندت یار و چاوی خۆشبەختیت ڕۆشن کە بوویە هاوسـەر و هاودەمی پیرێکی پوختە و جیهاندیتە و سەرما و گەرما چێشتوو و لە کوورەی چاکە و خراپە

دەرچوو و هاودەمزان و ئامادەیەکی سۆز و بەڵێن و پەیمان بەجێهێن و دڵسۆز و بە بەزەیی و مەشرەف خۆش.

دوو تاکی

تاکـــو بتـــوانم، دڵت بێنمـــە دەست
ئـــازاریـــشـــم دەی، نـــاتـــکـــەم ئـــازووردە

ئەگەر وەک تووتیش، خـوارینت شەکـر بێ
بەگـــیـــانی شـــیـــرین، ئەتکەم پەروەردە

نەکەوتیە دەست لاوێکی لەخـۆبایی و خـۆپەرست و کـەللەڕەق و دەمـدەمی هەر دەمـەی بـەرەو لایەک و بەرەو خـۆشـیـیـەکـەوە ڕاکـا و هـەر شـەوە لـە جـێگەیەکدا بمێنێتەوە و هەر ڕۆژە یارێ بگرێ.

پارچە

لاوان دڵ خـۆشن، ڕوخـسـاریان جـوانە
بەلام لەگەڵ کەس، دۆست نین هەتا سەر

چاوەڕێی وەفـــا، مـــەبە لە بولبـــول
هەردەم بۆ گـوڵێ، ئەخـوێنێ سـەحـەر

بە پێچـەوانەی پیرانەوە کـە بە گـوێرەی زانایی و دارایی خـۆیـان ژیان بەسـەر ئەبەن، نەک بە پێی نەزانی و خۆپەرستی و لاوەتییەوە.

یەک تاکی

لەخۆت چاکتر وەبینە، هەل وەدەست خە
لەگـەڵ یەکی وەکـو خۆت، ون دەکـەی ژین

پیرە گوتی، بەم جۆرە زۆری لەسەر ڕۆیشتم، تا گومانم برد کە دڵی کەوتووەتە داوەوە و بووەتە نێچیرم، لە پڕ هەناسێکی ساردی لە ناخی دەروون و قووڵایی

سینەی پڕ دەردیەوە هەڵکێشا و گوتی:

"ئەو هەموو قسانەی کردتن، لە تای تەرازووی ئەقڵی مندا کێش و بایەخی ئەو تاکە وشەیەیان نییە، کە لە ناو تیرە و هۆزەکەی خۆمدا بیستووە کە جوانە ژن تیرێکی بە تەنیشتەوە بێ چاکترە، نەک پیرێک.

هۆنراو

کە ژن لە دەستی مێرد، دیتی شتێک..
شـــۆرە وەک لێـــوی پیـــاوی ڕۆژوودار
ئەڵێ ئەم پیـــاوە، مـــردووێکی پێـــیـــە
کە نووشتە هەر بۆ، نووستوان دێتەکار

چوارینە

ژنێک لەبەر پیاوی، ئێسک قورس هەستێ
لەو مـــاڵە ئەبێ، جـەنگ و جـۆ هەســـتێ
پیـرێک لە جێی خۆی، ڕاست نەبێتـەوە
بە داری نەبێ، داری چۆن هـەســــــتێ؟

بە کورتییەکەی پێک نەهاتن و نەگونجان و لێک جودا بوونەوە کە ماوەی (عیددە) ی ژنەکە تەواو بوو لە لاوێکی توند و ڕووگرژ و دەست و پێ سپی و بەدخوو مارە کرا، تا خوا حەزکا ئازار و ئەشکەنجە و لێدان و کوتانی دیت و زۆری ڕەنج و ناخۆشی کێشا، لەگەڵ ئەوەشدا ژنە هەر ئەیگوت:

"سوپاس بۆ خوا کە لەو ئازارە پڕ ئێشەی پێشووم ڕزگار بوو و گەیشتمە ئەم خۆشییە هەمیشەییە".

یەک تاکی

له هەموو جەور و هەموو توند خوویی
بارت دەر ئەبەم، چونکە شیرین رووی

پارچە

روخساری جوان و کراسی ئاوریشم
گولاو و عوود و بۆن خۆشی و هەوەس
ئەمانە هەمووی، جوانی ژنانن
جوانی پیاوانیش، پیاوەتییە و بەس

هەڵبەست

سووتان لەگەڵ تۆ، له ناو دۆزەخدا
نەک لەگەڵ یەکێ تر بچمە بەهەشت
بۆن پیاز له دەمی جوانێ خۆشترە
نەک گوڵێ له دەست ناشیرین و زەشت

٣- سەرگوزەشتە

میوانی پیاوێک بووم له دیاربەکر، کە زۆر دارا و تەنیا تاقە کوڕێکی هەبوو جوانکیلە، شەوێکیان بۆی گێڕامەوە کە بە درێژایی تەمەنی خۆی هەر تەنیا ئەم کوڕەی بووە، پێی گوتم:

(لەو دۆڵەدا درەختێک جێ نەزەرگەیە، خەڵکی بۆ ڕاز و نیازان دەچنە ئەوێ، گەلێک شەوان له پای ئەو درەختەدا ناڵاوومەوە، تا ئەم کوڕەی پێ بەخشیوم.

بیستم کە بەفسکەوە کوڕەکە بە ئاواڵەکانی خۆی گوتووە، ئەگەر دەمزانی ئەو درەختە له کوێیە، دەچووم لێی دەپاڕامەوە تا باوکم بمرێ.

خواجە: "کەورە دڵخۆشە کوڕەکەم ژیرە و کوڕە گازندە ئەکا کە باوکم زۆر بڵێ و بێ بیرە".

پارچه

سـاڵەها بەسـەر تۆدا تێپەڕی
بێ وەی لە گۆڕی باوکت سەرێک دەی

تۆ بۆ باوکی خۆت، چاکەی چیت بووە
تا لە کوڕەکەی خۆت، وا چاوەڕێ کەی

٤- سەرگوزەشتە

ڕۆژێک بە هەوای لاوەتییەوە لە سەفەرێکدا خێرا ڕۆیشتبووم، دەمەو ئێوارێ لە پاڵ گردێکا لێی کەوتم چونکە زۆر ماندوو بووبووم، پیاوێکی لەڕ و لاواز و پیر کە بە دوای کاروانەکەدا ئەهات گەیشتێ و لێی پرسیم: "کە بۆچی لێی ڕاکشاوم و ئێرە جێی نووستنێ نییە؟!"

وەڵامم دایەوە: "چۆن بڕۆم، پێی ڕۆینێم نەماوە؟ " پیرەگوتی:

"نەتبیستووە کە خاوەن دڵان گوتوویانە: "ڕۆین و دانیشتن چاترە، لە پەلەکردن و پەککەوتنێ".

پارچە

ئەوەی بە تاسـەی بگەیتـە قـۆناغ
پەندی مـن لە گوێ بگر ە و فـێربە تۆ

ئەسـپی عـارەبی، هەر دوو لینگ ئەدا
وشـتر شـەو و ڕۆژ، ئەڕوا لەسـەرخـۆ

٥- سەرگوزەشتە

لاوێکی زرینگ و ناسک و چوست و چالاک و دەم بە پێکەنین و زمان شیرینمان هاودەم و هاوڕێ بوو؟، وا ڕێک کەوت ماوەیەک لێک دابڕاین، کە چاوم پێی کەوتەوە ژنی هێنابوو و منداڵی پەیدا بووبوون، بەڵام وا پێ دەچوو ڕەگ و ڕیشـەی خۆشییەکانی بڕاوە و گوڵی ڕووی سیس و ژاکاو و هەڵوەریوە، لێم پرسی:

"چۆنی و لە چ دای؟ وەڵامی دایەوە: "کە منداڵم بوون، منداڵیم وەل کرد"

## هۆنراو

(سا جوانی لە کوێی، پیری مووی گۆڕیم
چەرخـەڵەی دەوران، بەسـە بۆ ترسـان)

## یەک تاکی

کـە پیـر بووی، مـەکـە کـاری منداڵان
وازی و گـاڵتـە و گـەپ، تەنیـا بۆ لاوان

## دوو تاکی

خـۆشـی لاو لە پیـر، مـەخـوازە ئەتۆ
ئاوێک کـە ڕۆیی، ناچێتـەوە ناو جـۆ
کـاتێ دەغڵ و دان، گـەیشـتـە دروێ
کـەرووێشکە ناکـا، وەکـو سـەوزەی نەو

## پارچە

سـەردەمی لاویم لە دەست چوو ڕۆیی
ئـاخ و پـەرۆش بـۆ، ڕۆژانـی دڵـگـر
هێـزی چەپۆکی، شـێـرانەم نەمـا
ئێـسـتـا بە پەنیـر ڕازیم، وەک بەبر
پیـرێژنێک مـووی خـۆی، ڕەش کـردبۆوە
پێم گـوت: داپیـرەی، دێرینەی دەور
وا بەفـێڵ مـووی خـۆت، ڕەش کـردۆتەوە
پشتی کووڕت چۆن، ڕاست ئەکەی چیتر

٦- سەرگوزەشتە

لە نەزانیی لاوەتییەمدا ڕۆژێک بەسەر دایکمدا قیژاند، بەدڵ شکاوییەکەوە لە گۆشەیەکدا دانیشت، بەگریانەوە گوتی:

"مەگەر وردی خۆتت لە بیر چووەتەوە، کە درشتی بەسەر مندا ئەکەی؟"

خانە

پیرێژنێک چەند خۆش، بە کوڕەکەی خۆی گوت
کە دی پڵینگ و فیلێکی کوشتن
کاتی منداڵیت، گەر بێتەوە یاد
چەند بێ نەوا بووی، لە باوەشی من
ئەو ڕۆژە نەت کرد، جەفا لەگەڵما
ئێستا شێرپیاوی و منیش پیرێژن

٧- سەرگوزەشتە

کوڕی دەوڵەمەندێکی قرچۆک نەخۆش کەوتبوو و خێرخوازان پێیان گوت، یا خەتمێکی قورئان یان قوربانییەکی بۆ بکە، ماوەیەک داما و گوتی: "خوێندنەوەی قورئانەکە باشترە، لەبەرئەوەی پەز دوورە، یەک لە پیاوچاکان گوتی: "بۆیە خەتمی قورئانی هەڵبژارد چونکە قورئان لەسەرزارە و زێڕیش لە ناخی گیانە".

پارچە

ئەگەر نوێژکردن بە پارە بووایە
بۆ هەر نوێژێک، شتێک بدرایە
زۆرێک لە قورا، ئەچەقین وەک کەر
سەد ئەلحەمدیان بۆ، ئەخوێندی لەبەر

٨- سەرگوزەشتە

لە پیرەمێردێکیان پرسی: "بۆ ژن ناهێنی؟ وەڵامی دایەوە: "کە لەگەڵ پیرێژنان

هەڵناكەم" و پێیان گوت: "لەبەرئەوەی هەتە، کەواتە کچە جحێڵەکی بێنە" و گوتی: "ئەوە من پیرێکم و نامەوێ لەگەڵ پیرێژنێکیدا ناژیم و هەڵ ناکەم، ئەی چۆن کچە جحێڵەیەک لەگەڵ پیرێکی وەک مندا دەژی و هەڵ دەکا؟"

پارچە

پیـری حـەفـتـا سـاڵ، ناکـرێ دڵدارێ
زگـمـاک تۆ کـوێری، مـاچێ کـەو بخـەو

هێـز لەلای خـاتوون، چاکـتـرە نەک زێڕ
قیسپێک لە سەد مەن گۆشت چاترە لای ئەو

٩- سەرگوزەشتە

بیـسـسـتم لە ئەو ڕۆژانـە، کـە پیـرێکی کـۆنە سـاڵ
بەو پیـریـیـە هـاتبـووە سـەری، کـە ژن بێنێ دواجـار

کـیـژێکی جـوانی هێنا، کـیـژە ناوی گـەوهـەر بوو
(گـەوهـەردان) ی لە گـشت کـەس، شـاردبۆوە نادیار

پێویستی بووک گواستنەوەی، یەک بەیەک کردن تەواو
بەلام عەسای پیرەی نووست، هەر لە گۆڕمی یەکەم جار

کـەوانی کـیـشـا و نەیدا، لە ئامـانج کـە نادروێت
بە سـووژنی پۆلا نەبێت، کـوتاڵی کـەری باردار

دەستی بە گلەییان کرد، لای دۆستان بەڵگەی هێنا
کە مـاڵ و سامـانی من، ئەو شـۆخـە دای بە خـەسـار

لە نێـوان ژن و مـێـرد دا، هەرا و زەنا بەرپا بوو
سەری کێشا لای قازی، تا "سەعدی" هاتە گوفتار

هیچ سووچی نییە کچە، بەستیەتی ئانە و تەشەر
چۆن کوون دەکەی بلەزێ، دەستت.. گەوهەری شەهوار

دەرگەی حەوتەم

# لە کاریگەریی پەروەردەوە

١- سەرگوزەشتە

وەزیرێک کوڕێکی گێلۆکەی هەبوو ناردییە لای زانایەک تا فێرە خوێندنی کات تا دێتەوە سەرخۆ و ئاقڵ دەبێ، ماوەیەکی پێوە خەریک بوو هیچ سوودێکی نەبوو، زانایەکە یەکێکی نارده لای باوکی کوڕەکە و ڕایسپارد کە کوڕەکەی نەک هەر ئاقڵ نابێ، منیشی شێت کرد.

پارچە

هیچ مشتومالێک، زاخاوی نادات
ئاسنێک ئەسڵی، کە بەدجەوهەر بێ

سروشتی هەر شتێ، باش و بەجێ بێت
کاری پەروەردەی، ئەبێ لەسەر بێ

سەگ بە ئاوی حەوت، دەریایان بشۆی
گلاوتر ئەبێ، کە هات و تەڕ بێ

گەر کەری عیساش، ببەن بۆ (مەککە)
کە گەڕایەوە، دەبێ هەر کەر بێ

٢- سەرگوزەشتە

دانایەک ئامۆژگاری منداڵانی دەکرد کە ئەی گیانی بابەکان هونەر فێربن، چونکە سامان و دارایی دنیایە، پشتی پێ نابەسترێ و زێڕ و زیو جێی مەترسییە، چونکە

له وانه‌یه دزێک به جارێک بیبا، یا خاوەنەکەی وردەوردە بیخوا، بەڵام هونەر سەرچاوەیەکی هەمیشە خوڕێنە و سامانێکی هەمیشە بەردەوامە، ئەگەر هونەرمەندێک دەوڵەت و دارایییەکەشی نەمێنێ باکی نییە، چونکە هونەر هەر بۆ خۆی سامان و دارایییە و لە هەر شوێنێک بێ هەر ڕووەتە و لە هەورازی دائەنیشێن و ئەوەی هونەریشی نییە و دەست و پێ سپییە، دەبێ گوێچکە نانان کۆکاتەوە و دژواری و ناخۆشییان ببینێ.

یەک تاکی

مل کەچکردن دژوارە، دوای ماڵ و سامانداری

بەناز پەروەردەبوون و جەوری خەڵکی و نەداری

پارچە

جارێک فیتنەیەک، لە شام بەرپا بوو

هەرکەسە و کونجی، خۆی بەجێ هێڵا

جووتیار زادەکان، کەوا زانا بوون

هەموویان بوونە، وەزیری پاشا

کورانی گێلی، وەزیرەکانیش

بۆ لای جووتیاران، چوون وەکو گەدا

٣- سەرگوزەشتە

زانایەکی گەورە شازادەیەکی دەرس دەدا و فێرە زانیاری دەکرد و بێ پەروا لێی ئەدا و زۆر بە توندوتیژی لەگەڵیدا دەجووڵایەوە و ڕەفتاری لەگەڵدا ئەکرد، تا چیتر خۆی پێ ڕانەگیرا و بەرگەی ئەو هەموو ئازارەی نەگرت و بۆ سکاڵا چووە لای باوکی و چمکی کراسەکەی لەسەر لەشی دەردمەندی هەڵدایەوە، باوکی کزە لە دڵیەوە هات و زۆر توند بوو، مامۆستای بانگ کرد و گوتی: "دەبینم ئەو جەور و جەفا و ئازارەی بە کوڕەکەی منی دەگەیەنی لەگەڵ منداڵی ئەو خەڵکەیدا نایکەی، بۆ؟.. وەڵامی دایەوە:

وردبوونەوەو گفتوگۆ و هەڵسوکەوت و ڕەفتاری پەسند بە گشتی بۆ هەموو کەسێک پێویستە، بە تایبەتیش بۆ پاشایان، چونکە هەرچی ئەوان بە دەست و زمانیاندا بێت ئەوە بەسەر دەموزاری خەڵکەوەیە، بەڵام کردارو گوفتاری خەڵکە ڕەشوڕووتەکە ئەو بایەخەیان نییە.

پارچە

گەر دەروێشێ سەد، ناپەسەندی کا
دۆستانی یەک لە، سەدی نازانن
پاشا گاڵتەیەک، گەر بێ بە زاریا
هەرێم بەهەرێم، ئەیبەن بە فرانن

کەوابوو ئەمە ئیشی مامۆستای شازادەکانە کە لە پەروەردەو خوو و ڕەوشتی بەرز و جواندا قاڵبیان بکاتەوە (أنبتهم الله نباتا حسنا) واتە: خوا زۆر جوانی ڕواندوون و پێی گەیاندوون. بۆیە دەبێ مامۆستاکان کۆششێکی زیاتریان لەگەڵدا بکەن لەوەی لەگەڵ منداڵی عەوام و ڕەشوڕووتدا ئەیکەن.

پارچە

هەر کەس بە منداڵی، سزا نەدرابێ
بەختی باش نابێ، کاتێ بوو بە پیاو
داری تەڕ چۆنت، ئەوێ بای بدە
وشک بە ئاگر، ڕاست ئەبێ تەواو

یەک تاکی

منداڵێک لە دەست، مامۆستای.. ئازار
نەبینێ، ئەخوا جەفای ڕۆژگار

پاشا دەمودووی قسە و ڕاوێژەکانی مەلای مامۆستای لەلا پەسند بوو و پێیان

دڵخۆش بوو، خەڵات و بەراتێکی باشی پێ بەخشی و پلە و پایە و جێگای بەرزتر کردەوە.

٤-سەرگوزەشتە

مامۆستایەکی سوختەخانەم لە وڵاتی مەغریبێدا دیت، ڕووترش و وتارتاڵ و بەدخوو و مەردوم ئازار و چاو لە دەست و خۆ نەگر، لەبەر ئەوە موسڵمانان هەر لە چاوپێکەوتنێشی بێزار بوون، کە قورئانی دەخوێندەوە، قورئانەکەی لە بەرچاوی خەڵک ئەخست، کۆمەڵێکی کوڕ و کچی بێ گوناه و پاک و بێگەرد بە دەستیەوە پێوە بووبوون و گیریان بە دەست جەور و جەفاکانیەوە خواردبوو. نەیاندەوێرا نە پێ بکەنن و نە بدوێن کە زللەیەکی لە کوڵمەی زیوینی یەکێکیان ئەدا و لاقی بلووڕینی یەکێکی تری ئەخستە فەلاقەوە.

بیستم شتێکی ناخی دەروونی پیسیان لەلا ئاشکرا بوو و دەرکەوت، باشیان لێ دا و دەریان کرد، ئەوجا سوختەخانەکەیان دایە پیاوچاکێک، کە پیاوێکی دیندار و هێمن و باش و دانا بوو، لەکاتی پێویستیدا نەبوایە نەئەدوا و نەدەبووە مایەی ئازاری کەس و منداڵەکان ترسی مامۆستای پێشوویان لەسەردا نەما و خوو و ڕەوشتی فریشتەیی مامۆستای دووەمیان بەهەل زانی، لە یەکتر بوون بە دێو و نەرموشلی و لێبووردەیی ئەویان قۆستەوە و خوێندنیان لە بیر کرد و پشتیان تێ کرد، بەشی زۆری کاتەکانیان بە یارییەوە بەڕێ دەکرد و تەختەی لەسەر نووسینێیان ئەشکاند.

پارچە

مامۆستای مەکتەب، کە بوو بێ ئازار

منداڵ شەڕە بەرد، ئەکەن لە بازاڕ

پاش دوو هەفتە وا ڕێک کەوت، هەر بەو مزگەوتەدا تێپەڕیم، دووبارە مامۆستاکەی پێشووم چاو پێ کەوتەوە، کە دڵخۆشییان دابووەوە و ئاشتیان کردبووەوە و لە جێیەکەی خۆیان دامەزراندبووەوە: لە دڵم گران هات و لاحەولە وەلام لە زاری دەرپەڕی و پرسیم: ئەوە بۆ دووبارە شەیتانیان کردەوە مامۆستای فریشتان، پیرەمێردێکی خۆشی دنیا دیتە، گوێی لێم بوو و پێ کەنی و گوتی:

دوو تاکی

پاشـــایەک کـوڕی نارده قـوتابخـــانا
تەخـــــتێ زیویشـی، لـەبـەردەم دانا

بەزێڕ لێی نووسی، باشـتـربێ لەلات
لە میـهری باوک، جەوری مامـۆستـات

٥- سەرگوزەشتە

منداڵی خـواپەرستـێک دارایییەکی زۆری بە میـرات بـۆ مـابووەوە دەستـی کرد بە داوێن پیسی و کاری خـراپ و مـاڵ و سـامـان بەفـیـڕۆدان، بـە کورتیـیـەکـەی هیچ کـردەوەیەکی ناشـیـرین نـەمـا نەیکا و هـیچ مـەی و شـەرابێک نەمـا نەیخـواتەوە، جارێکیان ئامۆژگاریم کرد و گوتم:

"کوڕی خۆم! دەرامات ئاوی ڕەوانە و خەرجکردنیش ئاشێکی لە گەڕ، واتە زۆر خەرجکردن بۆ کەسێک دەست ئەدا کە دەراماتێکی دیارو بڕدراوەی هەبێ.

پارچە

کـە دەخلت نیـیـە، خـەرجـیت بگرەوە
دەریـاوان دەڵێن، ســـروود پڕ بـەزاری

ئەگـــەر لە کـــێــوان، باران نەبارێ
بـە ســـاڵێک دیجلە، وشکە بەجـــارێ

ڕێی ئـەقڵ و ئەدەب بگرە و واز لە گـاڵتـە و یـاری بێنە، کـە دارایـیت دوایـی هـات ئەکەویە ناخۆشـیـیـان و پەشـێـمـان ئەبیـتـەوە، لاوەکە لـەبەر خـۆشـیـی مـەی و نـەی قسـەکەی منی نەچووە گوێی و ڕەخنەشی لە قسەکەم گرت و گوتی: "ناخۆشکردنی خۆشی و ڕابواردنی ئێستا، بە بیـرکـردنەوە لە ناخـۆشـیـیـەکانی سبـەینێ کـاری ئاقڵمەندان نییە."

دوو تاكی

بۆچی خودانی، خۆشی و خۆش بەختی
بەترس و لەرزن، لە ڕۆژی سەختی؟!

بڕۆ ڕابوێرە، برالەی دڵ خۆش
نەكەی بۆ سبەی، خۆت بكەی پەرۆش

جا باشە چۆن ئەتوانم لێی بگرمەوە كە من تازە لە لووتكەی بەرزی سەخاوەت و دڵ والآیی دام و دەستی پیاوەتیم ڕاخستووە و ناوی چاكییەم كەوتووەتە سەر زار و زمانی هەموو كەسێكەوە.

دوو تاكی

ئەوەی ناودار بوو، بەسەخاو كەرەم
نابێ گرێ بدا، لە كیسەی درەم

ناوی پیاوەتی، كە بوو بەربڵاو
لێی ناشیرینە، دەرگای داخراو

سەیرم كرد پەند و ئامۆژگارییەكانی من وەرناگرێ و گەرمی هەناسەشم كار لە ئاسنی ساردی ئەو ناكا، وازم لێ هێنا و ڕووم لە دۆستایەتییەی وەرگێڕا، پەیرەویم لە گوتەی فەیلەسووفان كرد كە گوتوویانە (بلغ ما عليك فأن لم يقبلوا ما عليك) یانی: (ئەوەی لەسەرتە بیگەیەنە، ئەگەر لێشیان وەرنەگرتی و قبووڵیان نەبوو، ئەوە تۆ هیچت لەسەر نییە)

پارچە

بلێ بەوانەی گوێت لێ ناگرن
هەرچی ئەیزانی، لە خێرخوازی و پەند

ڕەنگە ببینی، زوو پیاوی گەوج
بەهەر دوو پێیان، كەوتۆتە ناو بەند

دەست لە دەست ئەدا و ئەڵێ درێغـا

گوێم نەدا پەندی، پیاوی دانیشمەند

تا پاش ماوەیەک ئەوەی بۆیم لە خەیاڵ و لەبەرچاوی خۆم گرتبوو بەچاوی خۆم دیتم کە پینەی لەسەر پینەی جلەکانی ئەدا و تیکە تیکە نانی کۆ ئەکردەوە و دڵم بەحاڵی بێ دەرەتانییەی سووتا، بە چاکم نەزانی بەو حاڵەیەوە قەتماغە زامی دەروونی بەسەر کۆنەکردنێی بکولێنمەوەو خوێی وە سەرکەم، بۆیە بەخۆمم گوت:

دوو تاکی

برادەری سپڵە، لەوپەڕی مەستی

بیر ناکاتەوە، لە کۆتا دەستی

دار گەڵای سەوز، ئەدا بەهاران

کە زستان داهات، ڕووتە وەک جاران

٦- سەرگوزەشتە

پاشایەک کوڕەکەی دایە دەست ئەدیبێک و گوتی: "ئەمە کوڕی خۆتە و پەروەردەی بکە و پێی بگەیەنە، وەک کوڕەکانی خۆت". وەڵامی دایەوە:

"فەرمانبەردار و ملکەچم".

چەند ساڵێکانی پێوە ماندوو بوو، بەڵام هەوڵ و کۆشش و ماندووبوونەکەی بێ سوود بوو و منداڵەکانی ئەدیبەکە هەموو لە ڕەوانبێژی و وێژە و زمان ڕەوانیی بوونەوە.

پاشا سەرزەنشتی ئەدیبەکەی کرد و چاوی هەڕەشەی لێ سوور کردەوە و پێی گوت: "بە پێچەوانەی قسەی خۆتەوەت ڕەفتار کرد و ناپاکیت کرد" ئەدیبەکە وەڵامی دایەوە: "با لەلای پاشا و خودانی سەر زەوی، شتێکی شاراوە نەبێ کە: پەروەردە و فێرکردنەکە هەریەکە و بۆ هەمووانیش وەک یەکە بەڵام، سروشت و شەقڵەکان جیاوازن.

پارچە

زێڕ و زیو هەمـــووی، لە بەرد دێتـــەدەر
لە گشت بەردێکیشدا... نییە زیو و زەڕ

ڕووناکی ســوهەیل، بۆ گشت یەکسـانە
لێـــرە چەرم ئەکـــەن، لەولا هـەنبـــانە

٧- سەرگوزەشتە

لە یەکێک لە پیرانی تەریقەتم بیست بە موریدێکی دەگوت:

"ئەوەندەی ئادەمـــیزاد دڵی بە مـــووچەو بەرات و بژێوییـــەوەیە، ئەوەندەی دڵ بە مووچە و بەرات و بژێوی دەرەوە (خوا) بوبووایە، پایەی لە پایەی فریشتان بەرزتر دەبوو."

پارچە

لەوکـــاتەدا، خـــوا لە بیـــری نەکـــردی
کـە نوتفـەیەک بوویت و نادیار و مـەدهۆش

گیـان و هەست و ژیری و شـەقڵی پێ دای
جـوانی و نوتق و هـەست و بیـروڕا و هۆش

دە ئەنگوسـتی لە بۆ دانـای، لەسـەر دەست
دوو قـۆڵی بۆت، لەســەر شانان داوە جـۆش

هەی بێ هیـمـمـەت، ئەوێسـتـا وا دەزانی
لە مـووچە و ڕزقـی خـۆیت کـا فـەرامـۆش!!

٨- سەرگوزەشتە

عارەبێکی دەشتەکیم دیت بە کوڕەکەی خۆی دەگوت:

(یابني أنك مسئول یوم القیامة فیما ألتسبت، ولا یقال لمن انتسبت) واتە: "کوڕی

خۆم له قیامەتێ لێت دەپرسنەوە داخوا له دنیایەدا چیت کردووە، لێت ناپرسنەوە داخوا سەر بەکێ و کوڕی کێ بووی؟"

پارچە

کـــراسـی کـــابە، بۆیە مـــاچ ئەکـــەن
نەک لەبەروەی بە، ئارمووش ناوداربوو
لەگـەڵ ئازیزێک چەند ڕۆژێ دانیـشت
بۆیـە وەکـو ئەو، مـــەزن و ڕێزدار بوو

٩- سەرگوزەشتە

له نووسراوەی داناپانەوە ئەگێڕنەوە کە دووپشک وەکو هەموو گیانلەبەرەکانی تر له دایک نابێت، بەڵکە ناو هەناوی دایکیان دەخۆن و زگی دەدڕن و دێنە دەرەوە و ئەو پێستانەی کە له کونی دووپشکێدا دەبینرێن دیارە هی ئەوەن. جارێک ئەم قسەیەم لای پیاوێکی گەورە گێڕایەوە گوتی: "دڵم دەڵێ ئەم قسەیە ڕاستـە و هەر دەبێ وابێ، چونکە بە وردیەتییان ڕەفتاریان لەگەڵ دایک و باوکیاندا ئەوە بووە، بۆیە بە گەورەییەیان هێندە خۆشەویست و ئێسک سووکن"

پارچە

باوکـێک کـوڕەکـەی، ئاوا دەمـامـلاند
ئەی جوامـێر! له گوێ، بگرە ئەم پەندە
کەسـێک بۆ کـەسی خۆی وەفـای نەبێ
نابێـتـە دۆسـتی، سـەر لێـو بە خـەندە

پەند: له دووپشکیـان پرسی: بۆ بە زستـانان نایەیتـە دەرێ؟گوتی: بۆ بەهاوینان هێندە بەڕێزم تا زستانانیش بێمە دەرێ.

١٠- سەرگوزەشتە

ژنی دەروێشێک سکی پڕ بوو و لەسەر دەستان بوو، دەروێش کە له هەموو تەمەنیا

منداڵی نەبووبوو گوتی: "ئەگەر خوای گەورە کوڕێکم بداتێ، جگە لەو جلوبەرگانەی لە بەرمدایە، هەرچی هەمە بەسەر دەروێشانیدا دەبەشمەوە".

وارێک کەوت کوڕێکی بوو، زۆر دڵخۆش بوو، هەروەکو بەڵێنیشی دابوو، میوانداریيەکی گەورەی بۆ دەروێشان کرد.

دوای چەند ساڵێکان کە لە سەفەری شامێ دەگەڕامەوە، بەلای شوێن و جێی ئەو دۆستەدا تێپەڕیمەوە و لە ئەحواڵیم پرسی، بەڵام پێیان گوتم کوڕەکەی مەی خواردووەتەوە و بە شەڕ هاتووە و خوێنی ڕشتووە و هەڵاتووە و، لەبەر ئەمە باوکەکەی لە جیاتیی ئەو زنجیری لە گەردەن و پێی لە کۆت کراوە، وەڵامم دایەوە: "خۆی ئەو بەلایەی لە خوای گەورە و میهرەبان، بۆ خۆی داوا کرد".

پارچە

ژنانی سک پڕ، ئەی کەسی هۆشیار
کاتی منداڵبوون، ئەگەر بیانبێ مار
بەلای ئاقڵەوە، لەوە چاکترە
بیانبێ کوڕانی، خوار و ناهەموار

١١- سەرگوزەشتە

منداڵ بووم لەبارەی جحێڵی بوونێم لە گەورەیەک پرسی لە وەڵاما گوتی: "لە کتێباندا وا نووسراوە کە جحێڵی بوون سێ نیشانەی هەیە، یەکەم: پازدە ساڵی، دووەم: شەیتانی بوون، سێیەم: هاتنی مووی بەر، بەڵام لە ڕاستیدا هەر یەک نیشانەی هەیە و بەس، ئەویش ئەوەیە کە ڕەزای خوای بەرز و دلۆڤانی لەلا زیاتر بێ لە بەشی نەفسیی، کەسێ بەم جۆرە نەبێ بەلای ئەهلی تەحقیقەوە بە جحێڵ و بە باڵقبووی ناژمێرن.

پارچە

بە دیمەن بۆتە ئینسان، قەترەیەک ئاو
کە چل ڕۆژ مایەوە، لەناو منداڵدان

ئەگــەر بەچل ســاڵ، ڕێز نەكــا پەیدا
بەڕاســتــی نابێ، ناوی بنێن ئینســـان

پارچە

پیــاوەتی نەرمی و مــیــهــر و ســەخــایە
لات وانـەبــێ بـە، هـــەیـكـەلـە و نــیـگــار

هونەر پێـــویســــتـــــە، تا بكەی وێنە
لەبــەر هــەیــوانـان، بـە نـەخـش و زەنگـار

كە ئینسان نەبیبوو، گەورەیی و بەخشش
فەرقـی چییە مرۆ و، نەخشی سـەر دیوار

دنیـا خـسـتنە دەست، هـیچ هونەر نیـیـە
گـەر لە دەسـتت دێ، دڵـێ بكە دەسـتـدار

١٢- سەرگوزەشتە

ساڵێكیان ناخۆشییەک كەوتە ناو حاجییە پیادەكانی حەجەوە، من لەو سەفەرەدا پیادە بووم، بە ئینسافەوە بڵێم كەوتینە سەرو پۆتەڵاک و ڕووی یەكتری و جنێو و قـســەی ســووک پێكـتـر گـوتن، پیـاوێكم لە كـەژاوەكـەیدا دیت دانیـشـتـبـوو و بەهـاوڕێیـەكـەی دەگـوت: "سـەیرە! پیـادەكـانی سـەر تەخـتـەی شـەترەنجێ كـە هەڵدەكشێن و ئەچنە پێش بەرز و گەورەتر ئەبن، كەچی پیادە حاجییەكان، ئەوە بیابانیان هەموو بڕی، خراپتر بوون.

پارچە

لەمنەوە بە حاجی، مـەردوم ئازار بڵێ
ئەوەی بە ئازار، پێستی خـەڵک ئەدڕێ
ئەتۆ حـاجی نیت، حـوشـتـر حـاجییە
كـە دڕک ئەخـوا و بار هـەڵئـەگـرێ

١٣- سەرگوزەشتە

هیندۆکییەک فێرە ئاگربازییە بوو، دانیشمەندێک پێی گوت: تۆ کە ماڵەکەت لە قامیشە، ئەم یارییە بۆ تۆ نابێ بیکەی بە پیشە!

تاک

تا قسە نەزانی ڕاست و ڕەوانە، لەخۆوە مەیکە
ئەوەی زانیشت بۆ وەڵام نابێ، بیخۆوە مەیکە

١٤- سەرگوزەشتە

پیاوێک چاوی دێشا، چووە لای بەیتاڵی، بەیتاڵیش ئەو دەرمانەی کە لە چاوی چوارپێیانی دەکرد بۆی لە چاوی کرد، کابرا کوێر بوو. بردیاننە لای دادوەری، گوتی: هیچ تاوانێکی نییە، ئەگەر ئەوە کەر نەبووایە نەئەچووە لای بەیتاڵی.

مەبەستیش لەم قسەیە ئەوەیە: تا بزانی هەر کەسێک ئیش بەئیش نەزانێ بکات پەشێمان دەبێتەوە و لای ئاقڵمەندانیش بە گێل دەژمێردرێ.

پارچە

پیاوی ڕەوشەنبیر، وا سووک و ئاسان
قەت کار ناداتە، دەست پیاوی نەزان
حەسیرچن ئەگەر، کاریشی چنینە
کەچی نایبەنە، ناو کارگەی حەریر

١٥- سەرگوزەشتە

یەکێک لە پێشەوا گەورەکان، کوڕێکی لێهاتووی هەبوو مرد، لێیان پرسی: چی لەسەر گڵکۆکەی بنووسن؟ لە وەڵاما گوتی:

ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز، لەوە گەورەترن کە لەم چەشنە جێگایانەدا بنووسرێن، کە دوای ماوەیەک هەڵدەوەرن و بەردەبنەوە سەر زەوی و خەڵکی بەسەریدا دەڕۆن و پێی لێ دەنێن و سەگان پێی هەڵ ئەمیزن، ئەگەر دەبێ شتێکیشی لەسەر بنووسرێت ئەم چەند دێرە شیعرانە بەسن.

پارچە

ئای کە لەو کاتەی، سەوزە لە باغا
سەر دەردەهێنێ، چەند خۆشە دڵم
تۆش وەرە ئەی یار، تا دەمەو بەهار
ببینی سەوزە، گیای سەر گڵی گڵم

١٦- سەرگوزەشتە

خوا پەرستێک بە هەڵکەوت بەلای یەکێکی ساماندارا تێپەڕی کە دەست و پێی بەندەیەکی بەستبووەوە و لێی ئەدا، خواپەرست گوتی: "کوڕی خۆم! خوای گەورە بەندەیەکی خستووەتە ژێر دەسەڵاتی تۆ و تۆی کردووەتە گەورەی ئەو، سوپاسی خوا بکە و بەخششەکانی لەبیر مەکە و ئەوەندە ئازاری ئەم پیاوە مەدە، نەوەکو ڕۆژی قیامەتێ ئەو لە تۆ باشتربێ و ئەو دەمی شەرمەزار ببیەوە.

دوو تاکی

لە بەندە تووڕە، مەبە گەلێک جار
زۆری لێ مەکە، مەیدە دڵ ئازار
ئەوت کڕیوە، تۆ بە دە درهەم
خۆ بە توانای تۆ، نەڕسکاوە ئەم
ئەو تووڕەبوون و شانازییە تا چەن
هەیە لە ئێوەش، گەورەتر خاوەن
ئەی خاوەندەکەی، ئەرسەلان.. ئاغۆش[1]
فەرماندەکەی خۆت، مەکە فەرامۆش

لە گەورە و سەروەری جیهان - دروودی خوای لێ بێ - هاتووە کە گوتوویە:

گەورەترین داخی ڕۆژی قیامەتێ ئەوەیە کە کۆیلەیەکی خوا پەرست ئەبەنە بەهەشت و خاوەنە فاسقە بێ دینەکەی ئەبەنە دۆزەخ.

---

١. ئەرسەلان و ئاغۆش: ناوی دوو عەبدانن.

پارچە

لەگــەڵ بەندەیەک، کــە خــزمــەتکارە
ڕقی لێ مــەگــرە، زۆر مــەیکە دڵگیــر

ئابڕووچوونە، ڕۆژی قـــیــــامــــەتێ
کۆیلە ئازاد بێ و گــەورە بێ زنجیــر

١٧- سەرگوزەشتە
سـاڵێک لە بەڵخـەوە لەگەڵ شـامـیـیـانـدا چوومە سـەفـەرێ و ڕێگا لەبەر جـەردە و ڕێگران پڕ مـەترسی بوو، لاوێکمـان بۆ پارێزگاری و چاوساغـیـیـە لەگەڵا بوو، لە بەکارهێنانی مەتاڵ و تیرو کەواندا مەشقکردە بوو.
بە هەموو چەکێکی شارەزا بوو، هێندە بەتین و توانا و بەهێز بوو بە دە پیاوان کەمـەی کەوانی ئەویان پێ نەدەچەمایەوە و پاڵەوان نەبوو لەو دنیایەیدا پشـتی لە عـەردی بدا، بەڵام چونکە دەوڵەمــەند و بەناز پەروەردە بوو، دنیـای نەدیتـبـوو و نەچووبـووە سـەفـەران و تەپڵ و شـەیپووری پاڵەوانانی نەبیسـتـبوو و بریسکەی شمشیری سوارانی نەدیبوو.

خانە

بە دەســـتی دوژمن، نـەبـبـوو ئەســیـر
لە دەورووبەری، نـەبـاریـبــــوو تیــــر

وا ڕێک کـەوت من و ئەو لاوە پێکەوە کـەوتینە لای یەکـتـری و دەڕۆیشـتین، هەر دیوارێکی کۆنینەی هاتبایە پێش بەهێزی بازوو دەیڕماند و هەر درەختێکی گەورە و ڕەگازۆی دیبایە بەلایدا دەهێنا و دەیخست و بە شانازییەکەوە دەیگوت:

خانە

فـیل لە کـوێیـە، قـۆڵ و بازووی گـوردان[١] ببـینێ!
ئەی شێر کوا، تا دەست و پـەنجەی مەردان ببینێ!

---

١. گوردان: پاڵەوان.

ئێمە بەو حاڵەوە، دوو هێندی لە پشت تەپۆلکەیەکەوە سەریان دەرێنا، تەمای هەڵمەت هێنانی سەر ئێمەیان بوو یەکێکیان کوتکێکی پێ بوو، ئەوی تریان کەستەکێک، لە لاوەکەم پرسی:

"ئەوە چاوەڕوانی چی، دوژمن ئەوا هات".

خانە

بێنە چیت هەیە، پیاوەتی و زۆری
دوژمن بەپێی خۆی، هاتۆتە گۆڕێ

سەیرم کرد لاوە تیرو کەوانی لە دەست بەربووەتەوە و وەک مێژۆکێ تا سەر ئێسقانی دەلەرزێ.

خانە

نە هەرکەسی مووقەڵیش، بە تیری زرێ کونکەر
لە ڕۆژی هەڵمەتی جەنگاوەران، پێ دەنێتە دەر

چارەیەکی ترمان لەوە زیاتر نەدیتەوە، لەوەی کە شتومەک و چەک و جل و بەرگەکانمان بەجێ هێشتن و گیانمان بەساغی دەرباز کرد.

پارچە

مرۆی کارزان بنێرە، بۆ ئیش و کاری گرینگ
کە ئەتوانێ نەڕەشێر، بخاتە ئەڵقەی کەمەند

لاو گەرچی بازووی بەهێز و تەنی وەک فیلی هەبێ
لە ترسی هێرشی دوژمن، ئەشکێ جومگەی بەندبەند

سەرەنجامی جەنگ لەلای، جەنگ دیتە دیارە
وەک پرسیارێکی شەرعی، لە پێش دانیشمەند

١٨- سەرگوزەشتە

کوڕە دەوڵەمەندێکم دیت لەسەر گۆڕی باوکی دانیشتبوو و لەگەڵ منداڵە دەروێشێکدا هەرا هەرای بوو کە سندووقی گۆڕی باوکم لە بەردە و نووسینەکەی سەری ڕەنگینە و تاتە مەڕمەڕی لەسەر دانراوە و خشتی شینی پیرۆزەیی تێدا چەسپ کراوە، بەڵام گۆڕی باوکی تۆ، بە چی ئەچێ؟ گۆڕەکەی برێتییە لە دوو خشتی نزیک یەک و لەو دوو مشتە خاکەی کە بەسەریدا کراوە" منداڵە دەروێش ئەمانەی هەموو بیست و پاشدان گوتی: "هەتا باوکت دەتوانێ لەبن ئەو بەردە گرانانەی کە دای پۆشیوە بێتە دەرێ، باوکم ئەگاتە بەهەشت.

یەک تاکی

کەرێک تا باری، سووک بێ لە بانی
خۆش ڕەوتر ئەڕوا و زۆر بەئاسانی

پارچە

دەروێشێک کە دەکێشێ، باری گرانی هەژاری
هەرواش لە دەرگای مردن، ئەکاتن سووکە باری
کەچی ئەوەی بەخۆشی و بێ دەردەسەری ئەژی
لەبەر بوونی ئەمانە، دەمرێ مەرگی دژواری
هەرچۆنێ بێ ئەو دیلەی، کە لەزیندان رزگاربێ
دڵ خۆشترە لە میرێ، کەوتۆتە گرفتاری

١٩- سەرگوزەشتە

مانای ئەم فەرمایشتەم لە گەورەیەک پرسی چییە کە:

(أعدي عدوك نفسك التي بين جنبيك) - واتە: "گەورەترین دوژمنی تۆ ئەو نەفسەیە کە هەمیشە لەگەڵتایە"

وەڵامی دایەوە: "ماناکەی ئەوەیە، هەر دوژمنێک چاکەی لەگەڵا بکەی ئەبێتە

دۆستت. کەچی (نەفس) چەندی خۆشەویستی و چاکە و پیاوەتی لەگەڵا بکەیت، بەربەرەکانێت زیاتر دەکات و زۆرتر دوژمنتە".

پارچە

ئادەمی دەبێتە فریشتە ئاسا، بەکەم خواردنێ
گەر وەکو چوار پێیانیش بلەوەڕێ، ئەبێتە بەرد
مەرامی هەرکەس بهێنیتەدی، ئەبێتە ملکەچت
هەر نەفس نەبێ کە ملکەچیت کرد، فەرمانی دەرکرد

٢٠- سەرگوزەشتە

دەمەتەقێی "سەعدی" لەگەڵ داواکار (موددەعی)
دەربارەی دەوڵەمەندی و هەژاری

یەکێکم لە وێنەی دەروێشان نەک لەسەر ڕەوشتی ئەوان لە کۆڕ و دانیشتنێکدا دیت، دەستی بە هەرا هەرایە کردبوو و دەفتەری سکاڵایانی لە قسەی نابەجێ بە دەوڵەمەندان لێک واڵا کردووەتەوە و هەروا لە دووشی دەدا، تا قسەکانی بەو جێیە گەیشت کە دەروێشان دەستی چاکەیان بەستراوە و دەوڵەمەندیش پێی ڕاستەیان شکاوە.

خانە

سەخی لە دەستیدا نییە درەم
خاوەن سامانیش، نییەتی کەرەم

من کە پەروەردەی دەستی بەخششی گەورە پیاوانم، ئەو قسانەم بەلاوە گران بوو و گوتم: "براله! پیاوی دەوڵەمەند دەرامەتی هەژاران و زەخیرەی گۆشەنشینان و ئامانجی خودان پێویستیان و پەنای ڕێبواران و هەڵگری باری گرانی خەڵکانی ترن، خۆراک ئەدەن و ژێردەستە و بەردەستە و نۆکەرانیان هاوبەشی خواردن و خواردنەوەیانن و ڕێژەی چاوتێریەیان گەیوەتەوە پیر و بێوەژنان و خەڵک و دەر و دراوسێیان.

### هەڵبەست

دەوڵەمەند ئەبێ بکا، وەقف و بەخشش و میوانی
زەکات و فیترە و ئازادی و هەم دیاری و قوربانی

دەنا چۆن دەگەیتە ئەو دەوڵەتەی ئەوان، کە نەتوانی
لەو دوو ڕکاتە زیاتر بکەی، ئەویش بەسەد پەرێشانی

ئەگەر توانایی جوودە و ئەگەر توانایی سجوود (کڕنۆش) دەوڵەمەند باشتر دەتوانێ بیانگاتێ، چونکە پارەیان هەیە کە "بەخشش بدەن و جل و بەرگ پاک و خاوێن و بەناوبانگ و دەست و دڵ والآن و هێزی خواپەرستی لە پارووی چەوردایە، کە دیارە گەدەی بەتاڵ بێ هێزە و دەستی کورت بێ بەخشش و پێی بەستراو ناتوانێ بڕوا و چاکە لە سکی برسییەوە نایەت.

### پارچە

بە دڵ پەشێوی، ئەنوێ ئەو کەسەی
ئەزانێ نیــــیــــەتی، نانی بەیانی

مێروولە هاوین؟ گرد و کۆیەتی
تا زستان باتە، سەر بە ئاسانی

بێ کاری و هەژاری هەرگیز پێکەوە هەڵ ناکەن و یەک ناگرنەوە و پاڵ وێکدان و لێک خڕبوونەوە هەرگیز لە دەست کورتییەدا ناکرێ، ئەوەی دەوڵەمەندە نوێژی عەشای خۆی دابەستووە و ئەوەی هەژارە چاوەڕوانی خواردنی عەشایە و دەستەو ئەژنۆ دانیشتووە، جا ئەمانە چۆناو چۆن بەیەک ئەچن.

### خانە

خــاوەنی ڕۆژی، دوایی هەر خــوایە
دڵ پەڕاکــــــەندە، دڵ بەرەڵڵایە

خوا پەرستیی ئەمان، لە قبوڵ بوونێ نزیکترە چونکە هەمیشە بیریان گرد و

ئامادەیە و پەرت و بڵاونین، خەریکی ئیشی خۆیان و پەیداکردنی بژێوی خۆیانن، عەرەب ئەڵێ (أعوذ بالله من الفقر المكب وجوار من لا أحب) واتە: پەنا بە خوا لە هەژاری و لە نێزیکیی ئەوەی کە خۆشم ناوێ - دیسانەوە هاتووە کە (الفقر سواد الوجه في الدارين) واتە:

هەژاری ڕووی ڕەشیی هەر دوو دنیایانە.

گوتی: "ئەمەیانت بیستووە بەڵام ئەوەیانت نەبیستووە کە خۆشەویست - د. خ - فەرموویەتی: (الفقر فخري) واتە هەژاریی شانازی منە. وەڵامم دایەوە: بێدەنگ بە مەبەستی سەروەری عالەم - د. خ - بۆ تاقمێکە کە مەردی مەیدانی ڕەزان و مەتاڵی تیری قەزان، نەک ئەوانەی کە بەرگی پیاوچاکان ئەپۆشن و پارووی کە بەخێر ئەیاندرێتێ ئەفرۆشن.

چوارینە

ئەی تەپڵی بانگی، لە ناوەوە بۆش

بێ توێشوو بڵێ، تەگبیرت چییە، نیهایەت هیچە

ڕووی تەماع لە خەڵک، مەکە گەر پیاوی

تەزبێحی هەزار، دەنکیش لە دەست و پەنجەت مەپێچە

دەروێشی نەزان، ڕاناوەستێ و ئارام ناگرێ تا هەژارییەکەی نەگاتە کوفر (كاد الفقر أن يكون كفرا) واتە: هەژاری هێندەی نەماوە ببێتە کوفر، هەروەک چۆن بە دەستی بەتاڵ ڕووتێک پۆشتە ناکرێتەوە و بەبێ دەسەڵاتیش دیلێک ئازاد ناکرێت، کێ پایە و پلەی ئێمە دەگەیەنێتە ئاستی ئەوان و چۆن دەستی بەرز و توانا بە دەستی نزم و ناتوانا دەچێت و کەی وەکو یەکن؟! ئەی نازانی کە خوای مەزن لەبارەی خۆشیی خەڵکی بەهەشتدا ئەفەرمووێ: (اولئك لهم رزق معلوم) واتە: ئەوان بژێویی دیاریکراویان هەیە.

خانە

تینوو لە خەویا، وای دێتە بەرچاو

گشت جیهان وەکو، کانییە لە ئاو

کاتێ کە من ئەم قسەیەم بە دەمەوە بوو، دەروێش خۆی پێ ڕانەگیرا و جڵەوی دەروێشییەی لە دەست دەرچوو گەزارەی دەرکێشا و ئەسپی زمان پاراوی و ڕەوانبێژیی تانە و تەشەر و سەرکۆنەکردنێی لینگ دا و گوتی:

"زۆرت بە دەوڵەمەنداندا هەڵدا و زۆرت قسەی پەرت و بڵاو کردن، وات لێ کردن، تریاکی هەژاران بن، یا کلیلی ژووری زەخیرە، کۆمەڵێکی لەخۆبایی و فیزکەورە، خۆ پەسند و سڵ و چەمووش، کە هەر خەریکی کۆکردنەوەی دارایی و سامان و پارەن، و تینووی پلە و پایە و خۆدەرخستنن، بە زۆرەملێ نەبێ هەژاران نادوێنن و بەسووکی نەبێ سەیریان ناکەن. زانایانیان بە سواڵکەر دێتە بەرچاو. پێیان وایە ئەو سامان و پلە و پایەی هەیانە بە میرات بۆیان ماوەتەوە و هەر لە زگماکەوە هەیانبووە، جنێو بە مردووی هەژاران ئەدەن، لە سەرەوەی مەجلیسان دائەنیشن، باوەڕیان وایە، لە هەموو کەسێکان باشترن، دڵسۆزی پێشانی کەس نادەن، لە پەند و ئامۆژکاریی زاناو دانایان بێ ئاگان و گوێیان نادەنێ کە گوتوویانە: "ئەوەی بەخواپەرستی لە خەڵکانی تر کەمترە و بەڵام دەوڵەمەند و ساماندار و دیارترە، ئەوە هەر بە دیمەن بە تواناترە، دەنا لە ڕاستیدا پیاوێکی بێ دەرەتان و کڵۆڵ و هەژارە.

یەک تاکی

گەر کەودەنێک بەسامان، فیزکا لەسەر دانایەک

بەقوونی کەرێی دانێ، با گای عەنبەرینیش بێ

گوتم: قسەی سووک بەوانە مەڵێ و خراپەیان پێ ڕەوا مەبینە کە خاوەنی بەخشش و مووچە و بەراتن و دەست و دڵ واڵان"

وەڵامی دایەوە: "بەهەڵە چووی، ئەوانە نۆکەر و ملکەچی پارەن، بەچ کەڵک دێت کە ئەمانە وەک هەوری ئاوس و پڕن، بەڵام دانابارێنن و وەک سەرچاوەی هەتاون و ڕووناکی نادەنە کەس، ئەوانە سواری ئەسپی توانایین و بەڵام لێ ناخوڕن و هەنگاوێک لە ڕێی خوادا ناهاوێن و درهەمێک بێ خۆیادان و خۆهەڵسەنگاندن و جنێو نادەن بەکەس، ئەوانە بە ڕەنج و ئازار و ماندووبوون سامان کۆنەکەنەوە و بە قرچۆکی و ڕژدی و ڕەزیلییەوە دەیپارێزن و لە دواییشدا بە پەرۆش و غەم و حەسرەتەوە بەجێی دەهێڵن هەروەک گەورە پیاوان گوتوویانە:

"زێڕ و زیوی پیاوی قرچۆک ئەوکاتە لە ژێر خاک دێتە دەرەوە کە ئەو بۆ خۆی چووە ژێرخاکەوە"

خانە

دارایەک کۆکات، بەڕەنج و بە ئێش
کە یەکێ تر هات، ئەیبا بەبێ هێش

پێم گوت: "هیچ لەبارەی قرچۆکیی سامانداراناوە نازانی و ئاگات لێیان نییە، تەنیا بە هۆی سواڵکردنێوە نەبێ، دەنا هەرکەسێک واز لە چاوچنۆکییە بێنێ ئەوجا دەست و دڵ والایی و قرچۆکی بۆ دەرئەکەوێ، سەنگی مەحەک ئەزانێ زێڕ چییە و سواڵکەر دەزانێ قرچۆک کێیە.. گوتی: "لە تاقیکردنەوەی خۆمەوە ئەوە ئەڵێم، دەست و پێوەند و خزمەتکاری دڵڕەق و بێ ئابروو لەبەر دەرگایانیان دادەنێن تا دەست بەسینگی پیاوچاک و ئازیز و ئاوەزدارانەوە بنێن و بڵێن ماڵ کەسی لێ نییە، بەڕاستی راستیان گوتووە.

خانە

ئەوەی کە بیر و هۆش و خاوەنی کەماڵ نییە
بە دەرگاوانەکەی گوت، بڵێ کەس لە ماڵ نییە

گوتم: لەبەرئەوەی ئەمانە لە دەست سواڵکەران هاتوونە گیان و وەڕاڵە هاتوون و ئەقڵ دەیبڕێ کە ئەگەر لمی بیابان ببێ بە دوڕ و چاوی گەدایانی پێ ببێ پڕ.

هۆنراو

چاوی چاوبرسی بەماڵی دونیا
پڕ نابێتەوە، وەک بیر بە شەونم

لە هەر کوێیەک کەسێکت دیت هەژاری و تاڵی و سوێریی چەشتووە و بەهۆی چاوچنۆکییەوە خۆی دەهاوێتە ناو کاری مەترسیدارو پڕ تەڵەزگەوە و لە سزای دوارۆژ ناترسێت و هەراسان نابێت و ڕەوا و ناڕەوا لە یەکتر جیا ناکاتەوە و نایانناسێ.

## پارچە

کە سەگ کەستەکەگلێکی، لە پڕ وەسەری کەوێ
دائەچڵکێ لە خۆشییان، وا ئەزانێ ئێسقانە

گەر دوو کەس مردوویەکیان، لەسەر شانی دانابێ
پیاوی چاوچنۆک پێی وایە، ئەوەش هەر نان و خوانە

بەڵام خاوەن سامان و دارایی دنیا بەچاوی لوتفی خوا سەیر کراوە و ئاوڕی لێ دراوەتەوە و بەڕەوا و ناڕەوا ئاگادار کراوە. من هێشتا ئەم وتەیەم تەواو نەکردووە بەڵگە و بورهانم بۆ نەهێناوەیەوە هیوادارم ئینسافت هەبێ، داخوا هەرگیز دیوتە دەستی نزایەک بە شانەوە بەسترابێتەوە، یا بێ تاوانێک لە بەردەم دەرگای زیندانا دانیشتبێ یا بێ گوناهێ پەردەی ئابڕووی دڕابێ یادەستێک لە مەچەکەوە بڕابێ، ئەگەر لەبەر هەژارییە نەبووبێ؟ شێرەپیاوان کە پێویستی ناچاری کردوون، لە کوناندا گیراون. لەوانەشە یەکێک لە دەروێشان نەفسی ئەممارەی داوایەکی لێ بکات و ئەویش نەتوانێ خۆی لەبەر ڕاگرێ تووشی گوناهێکی ببێ، چونکە زگ و کیر جمکانەن واتە: دوو منداڵی بەزگێکن، تا یەکێکیان. دانیشتووە ئەوەی تریان بە پێوەیە، بیستم دەروێشێک بەسەر کارێکی خراپەوە گیرابوو، لەگەڵ شەرمەزارییەشیدا لە بەردەبارانێ دەترسا. گوتی: موسڵمانینە! توانای ژن هێنانیم نییە و خۆشم پێ ڕاناگیرێ چ بکەم؟ (لا رهبانية في الاسلام) واتە: ڕەبەنی لە ئیسلامدا نییە.

ئەوەی کە هۆی هێوری و ئارامی خوا پێداوانە ئەوەیە کە هەموو شەوێک خەرامانێکیان لە بەرو باوەشدایە و ڕۆژانە جوانێکیان لە ژوورسەرەوەیە کە ڕۆژی ڕووناک لە جوانی ئەو جوانە شەرمەزارە و دەست لەسەر سینگە و سەوڵی خەرامانیش لە حەسرەتا پێی لە قوڕایە.

## خانە

چەنگی ناوەتە، خوێنی ئازیزان
بە عەننابی سوور، سەر پەنجەی ڕەنگان

جا بۆیە ڕەوا نییە لەگەڵ جوان ڕوخسارێکی وادا لە خراپە بگەڕێت و ڕوو بکاتە ناڕەوایی.

یەک تاکی

دڵێک پەری بەهەشتی، بفرێنی و یەغمای کا
کەی ئاوڕ ئەداتەوە، لە بتانی یەغمایی[1]

هۆنراوە

ئەوەی کە خورمای تەڕی، لەبەردەم و دەستابێ
بەرد ناهاوێتە لقی دارمێو و هێشووە ترێیان

بەزۆری نەدارو دەست کورتەکان لە گوناهانەوە دەئاڵێن و برسییانیش نان دەفرێنن.

یەک تاکی

سەی دڕ کە گۆشتی، چنگ کەوت ناپرسی
ئێ حوشتری سالحە، یا کەری دەججال

چەندان ژنی داوێن پاک و ڕوو سوور لەبەر هەژاری و نەداریی کەوتوونەتە نێو داوی داوێن پیسیی و ناوی پڕ نرخی خۆیان داوەتە بەر بای ڕیسوایی.

یەک تاکی

لەگەڵ برسییەتی، هێزی پارێز نامێنی
هەژاری جڵەو، لە دەستی تەقوا دەستێنێ

ئەوەی کە گوتت، دەرگا لە ڕووی هەژاران دادەخەن، حاتەمی تایی کە لە بیابان دادەنیشت، ئەگەر لە شارێکدابایە لافاو و هێرشی گەدایان کراسیان لەبەردا ونجڕونجڕ دەکرد.

---

١. یەغما: لە نێوە دێری یەکەمدا بەمانای تاڵانە، لە دووەمدا – بەمانای شاری یەغمای تورکستانە کە بە ژنی جوان بەناوبانگە.

هەروەک لە کتێبی (طیبات[1])دا نووسراوە .

یەک تاکی

لە من مەنوارە با کەسی دیکەش نەکەن تەماشا
لەلای گەدایان چۆن چۆن دەتوانی خێرێ کەی حاشا

گوتی: "نا، من بەزەییم بەحاڵ و باڵی ئەواندا دێتەوە".

گوتم: "نا حەسرەت و داخ بۆ ماڵی ئەوانە دەخۆیت. ئێمە لەناو قساندا هەردووکمان یەکانگیر بووین، هەر داشێکی لەسەر تەختەی شەترەنجێ جووڵاند، من بە داشێکی تر، کشم پێ لە شای دەکرد و بە ئەسپێک دام ئەپۆشی، هەتا ئەوەی لە خورجێنێیدا بوو هیچی پێ نەما و دوا تیری تیردانی بەڵگەکانی هاویشتن.

پارچە

لە حاند هێرشی ئەو دەم هەراشە
وریات لە خۆت بێ، مەتاڵ فڕێ نەدەی

لە هەراوهوریا و فیشاڵ بەولاوە
چی دیکە نییە و تۆش گومان نەبەی

ئەو قسەزانەی دەمودوو تەڕەش
دەست بەچەکەوە لەبەر دەرکییە و قەلاش چۆڵەوەی

تا لە ئەنجاما بەڵگەی پێ نەما و کۆڵم پێ دا، ئەوجا کەوتە قسەی بێ کەڵک و وەک نەزانان کە بەڵگەیان بۆ بەرگریی پێ نامێنێ، زنجیری دوژمنایەتیی وەکار دێخن و وەک ئازەری[2] بت تراش کە لەگەڵ کوڕەکەیدا نەیتوانی و بەبەڵگە پێی نەوێرا و دەروەستی نەهات، بەشەڕ بۆی هەستا و گوتی:

---

١. طیبات: ناوی کتێبێکی تری "سەعدی" یە .

٢. ئازەر باوکی ئیبراهیم پێغەمبەرە.

(لئن لم تنتـه لأرجـمنك) واته: ئەگـەر نـەیبـڕیتــەوە بەرد بارانت ئەکـەم. کـەوتە جنێودانێم و ئەمنیش لە دەمیم دایەوە و یەخەی گرتم و ئەمنیش چەناگەیم گرت.

پارچە

من و ئەو هەر دووک بەیەکــــدا هـاتین

خەڵکیش لە دەورمـان، شادان و خەندان

لەوتەی ئێمەش پەنجەی سەرسامییـان

هەمـوو بەجـارێ خـســتـۆتە بەر دان

بە کـورتی دەمـەقـاڵێی ئەم قـسـە و هەرایانەمـان بردە لای قـازی و بە دادوەریی حـوکـومـەتی قـایل بووین، تـا دادوەری مـوسـڵـمـانـان مـەسـلـەتێکی بکات و دارێکی بەنێـوان سـامـاندار و هەژاراندا بێنێ. قـازی کـە حـاڵی ئێـمـەی بەو جـۆرە دیت و قسەکانی هەر دوولامـانی بیست سەری بردەوە ناو یەخەی بیرکردنەوەی خۆی و دوای لێ وردبوونەوە و تێڕامانێکی زۆر سەری هەڵێنایەوە و گوتی:

ئەی ئەو کەسەی کە ستایشی دەوڵەمەندانت کردووە و جەفا و خراپە و ناسازیی هەژارانت گـوتووە، ئەوەی بزانە کـەلە هەر جـێـیـەک گـوڵ هەبێ دڕکـیش هـەیە و لەهەرجـێـیـەک مەی لێبێ سەرخـۆش و مـەسـتـیشـی لێیـە و خـەزنەش لەکـوێ بێ مـاریشی لێیـە، گەوهەری شـەهـواریش نەهەنگی ئادەم خـۆری لەگەڵە و خـۆشی و بەختـەوەری دنیـایەش ژەهرو پێوەدانی دنیـایەی لـە دوایە. خـۆشـی و ڕابواردنی ناو بەهەشتێش دیواری دەردو ئازار و نارەحەتی دەوری داوە.

خانە

جەوری دوژمن چی بکاتن، گەر نەکا دڵخـواهی دۆست

گـەنج و مــار و دڕک و گـوڵ، شــادی و غــەم پێکەوەن

ئەی نابینی لە باغاندا داری بۆن خۆش و داری وشکیشی تیایە، دەوڵەمەندانیش پیـاوی ناسـوپاسگوزار و نیـعـمــەت ناشـونـاسـیـان تێـدایەو لە ڕیزی دەروێش و نەدارانیشدا پیاوی بەتوانا و خۆڕاگر و کڕووزاوەشیان تێدایە.

خانه

گەر دمنکە شەونم هەمووی دوڕ ئەبوو

وەک مــوورووە کــەرە، بازاڕ پڕ ئەبوو

نزیکانی حــەزرەتی باری گــەورە و بڵندپایە، ســامــاندارانی دەروێش ڕەوشت و دەروێشــانــی دەوڵەمــەند هیــمــەتن. چاکی دەوڵەمــەندان ئەوانەن غــەمی هەژاران دەخــۆن و چاکی دەروێشــانیش ئەوانەن دەوڵەمــەندانیــان لا ســووک و کــەمــە (ومن یتوکل علی الله فهو حسبە) واتە: ئەوەی پشت بە خــوا ببەستێ هەر ئەویشی بەسە دوای ئەمە، قازی ڕووی سەرزەنشتی لەمنەوە بردەوە سەر دەروێشی و گوتی: "ئەی ئەوەی کــە گــوتووتە! دەوڵەمــەندان هەر خــەریکی مــەســتین و بێ دین و خــراپن، دەستەیەکی دەوڵەمەندانی لەو جۆرەی تۆ ئەڵێی هەن، کە هیمەت کورت و ناشوکر و نیعمەت نەناسن، هەر وەرئەگرن و لەسەر یەکی دائەنێن و نایخۆن و ناشیدەن بەکەس، هەروەک ئەوەی: ئەگەر باران نەبارێ یا گەردەلوول و تۆف و زریان دنیای هەڵگرت، لەبەر بوونی سامان و دارایی خۆیان، گوێیان لە تەنگژە و سەغڵەتیی هەژاران نییە و لە خوای گەورە ناترسێن و ئەڵێن:

خانه

ئەگەر یەکێ تر لەبەر نەبوونی، ببێتن هیلاک

وا من بەلەمم هەیە و لەترسی، زریانم چ باک

هۆنراو

(ژنانی ناو کەژاوەی، سەر پشتی حوشترە مێیە

ئاوڕیــان نــەدایــەوە، لــەوەی ڕۆچــوو لــە لــمدا)

خانه

ناکــەســان بەڕیان کــە هێنا دەرێ

ئەڵێن چ غەم گەر، گشت عالەم بمرێ

ئەوە ئەو تیرە و تاقم و کۆمەڵەن کە بیستتن، تیرە و تاقم و کۆمەڵێکی تریش هەن، سفرەو خوانی بەخششیان ڕاخستووە و بەدوای دەنگ و ناو و ناوبانگەوەن و خوازیاری لێبووردنێن و خاوەنی دنیاو ڕۆژی دوایین، وەک بەندەکانی حەزرەتی پاشای عالەم، پشت و پەنا قایم بە خۆشەویستیی خوایی، سەرکەوتوو و خاوەن دەسەڵات لەناو خەڵکی، پارێزەری سنووری ئیسلام میراتگری موڵکی حەزرەتی سولەیمان، گەورە دادپەروەری پاشایانی زەمان خاوەن زەفەری دنیا و دین (ئەتابەگ ئەبوبەکری کوڕی سەعدی کوڕی زەنگی) خوا ڕۆژ و ڕۆژگاری پایەدارتر کات و بەیداغی هەر بەرز و شەکاوە بێت.

## پارچە

هیچ باوکێک ئەو ڕێزدارییەی لەگەڵ کوڕی خۆی نەکرد
کە دەستی بەخششی تۆ دای بە بنەماڵەی ئادەم

خوا ویستی کە پیرۆزییەک، بەو جیهانە ببەخشێ
وا تۆی بەرەحمەتی خۆی، کردە سەرداری عالەم

قازی کە قسەی گەیاندنە ئێرە، لە قەڵەمڕەوی گومانی ئێمەدا ئەسپی زێدە ڕۆییەی لینگ دا، سەرمان بۆ فەرمانی قازییەتییەی دانەواند، چاومان لە دەمەقاڵێ و ئەوەی لە نێوانماندا ڕووی دابوو پۆشی، ڕێی ئاشتەواییمان هەڵبژارد، لە لێبووردەمییدا سەرمان لەسەر پێی یەکتری دانا و سەر و ڕووی یەکتریمان ماچ کرد و گفتوگۆکەمان بەم دوو خانەیە دوایی پێ هێنا.

## پارچە

گلەیی لە سووڕی گەردوون مەکە، ئەی کاکی دەروێش
لە چارە ڕەشییتە گەر بەم شێوازەوە بمری

ئەی دەوڵەمەند هەتا دەست و دڵت والایە
بخۆ و ببەخشە کە تۆ دنیا و ئاخیرەت ئەگری

دەرگەی هەشتەم

# لەسەر پەیڕەوی هەڵسووڕاندنی ژیان

١- ڕەوشت

ماڵ بۆ ئاسوودەیی ژیانە، نەک هەر بۆ کۆکردنەوەی، لە دانایەکیان پرسی، کێ بەختیارە و کێ بەدبەختە؟ وەڵامی دایەوە: "بەختیار ئەو کەسەیە خواردی و چاندی و بەدبەختیش ئەوەیە مرد و بەجێی هێشت."

خانە

نوێژ لە سەر کەسێ مەکە، کە ڕۆی و هیچی نەکرد
لە کۆکردنەوەی ماڵدا خۆی دانا و هیچی نەبرد

"مووسا" سەلامی خوای لێ بێ - وای ئامۆژگاریی قاروونی[1] کرد: (أحسن كما أحسن الله اليك) واتە: چاکە بکە وەک چۆن خوا چاکەی لەگەڵدا کردی - بەڵام نەیبیست و ئەنجامەکەیت بیست.

پارچە

ئەوەی چاکەی نەکرد کۆ، لەگەڵ درهەم و دینار
دوایی سەری مەرگی خۆی، بەدینار و درهەم کرد

گەر ئارەزووی دەسکەوتی، ڕۆژی دنیاو ئاخیرتە
کەرەم بەخەڵکی بکە، چۆن خوا بە تۆی کەرەم کرد

عەرەب دەڵێ: (جد ولاتمنن لأن الفائدة إليك عائدة) واتە - "ببەخشە بێ ئەوەی منەت بکەی، ڕاستییەکەی سوودی بۆ تۆ دەگەڕێتەوە".

---

١. ناوی یەک لە دەوڵەمەندانی کۆنە، داراو سامانێکی زۆری هەبوو.

### پارچە

داری سەخاوەت لە کوێ ڕەگی کرد
بە ئاسمانا چوو، لق و پۆپی ئەو
ئەگەر بەهیوای، لە بەری بخۆی
بەمنەت بەلاوەی، مەنێ قەدی ئەو

### پارچە

سوپاسی خوا کە، سەرکەوتی بەخێر
لە بەخششی خۆی نەکردی بێ بەش
شانازی مەکە، شا خزمەت ئەکەی
بۆ بەردەوامیت، سوپاس کە پێشکەش

٢- ڕەوشت

دوو کەس ڕەنجیان بەبا چوو، یەکێکیان ماڵی کۆ کردەوە و نەیخوارد. ئەوی تر ئەوەی فێری بوو کاری پێ نەکرد.

### دوو تاکی

تۆ هەر چەندێکی، فێربی و بزانی
ئیشی پێ نەکەی، دیارە نادانی
نە ئەبتە زانا و نە ئاقل ئەبێ
چوارپێ بارێکی، کتێب لێ بکەی بار
جا ئەو بێ مێشکە، چووزانێ پشتی
چی لێ نراوە، کتێب یا بارەدار

٣- ڕەوشت

زانین بۆ ئاین پەروەردەکردنە، نەک بۆ دنیا خواردن.

خانە

ئەوەی زانین و زوهد و پارێز و تەقوای خۆی فرۆت
جۆخینێکی زۆر گەورەی وەکۆ کرد، بەڵام هەمووی سۆت

٤- ڕەوشت

زانایەکی خۆنەپارێز، کوێرێکی چرا بە دەستە (یهدی بە وهو لایهتدی) واتە: ڕێی پێ دەردەکا، بەڵام خۆی ڕێ دەرناکات.

خانە

بێ سوودە ئەوەی ژینی خۆی دۆڕاند
هیچی نەکڕی و زیڕی خۆی چوواند

٥- ڕەوشت

وڵات بە دانا و زانایانەوە جوانە و ئاین بە خۆپارێزانەوە، پاشایان پێویستییان بە ئامۆژگاری دانایان زیاترە، لە چوونە پێش و نزیکبوونەوەی دانایان لە پاشایان.

پارچە

ئەی پاشا ئەگەر پەندێ ببیسی
لە ناو دنیادا، پەندی وا نییە
کار هەر بسپێرە، بە پیاوی دانا
هەرچەند کار، ئیشی پیاوی وانییە

٦- ڕەوشت

سێ شت بێ سێ شت، پایەدار نابێ: ماڵی بێ بازرگانی و زانین بێ لێکۆڵینەوە و گفتوگۆ، کیشوەر و وڵات بێ سیاسەت.

پارچە

کاتێ بە دەمودووی خۆش، دڵی کەسێکت ڕاو کرد
بەتوورەیی بیدوێنی، بڵێ خۆڵت لە چاو کرد
چونکە سەد گۆزە نەبات، تاڵی گوژاڵکێ نابا
هەر چاکەیەک وابیکەی، یانی هەمووت لە ئاو کرد

٧- ڕەوشت

بەزەیی هاتنەوە بە پیاوخراپاندا ستەمە لە پیاوچاکان و لێبووردنیش لە زۆرداران ستەمە لە هەژاران.

خانە

ئەگەر بەدکارێ بلاوێنیەوە، وەکو پیاوچاکان
بەماڵی تۆوە تاوانی ئەوتۆ ئەکا، بێ پایان

١- پەند

پشت بە دۆستایەتی پاشایان و ئاوازی خۆشی منداڵان نابەسترێت، کە ئەمیان بە خەیاڵێک و ئەویان بە خەوێک دەگۆڕێن.

هۆنراو

دڵی خۆت مەدە یاری هەزار دۆست
گەر بیدەی داوتە، بۆ جودایی خۆت

٢- پەند

هەموو نهێنییەکانت بە دۆست و خۆشەویستەکەت مەڵێ کێ دەڵێ نابێتە دوژمنت و هەموو خراپەیەکیش لەگەڵ دوژمنتدا مەکە، نەوەک ببێتەوە دۆستت.

٣- پەند

ئەو نهێنییەی شاردووتەتەوە لای دۆستەکەتی مەدرکێنە، با دۆستێکی ڕاستیش بێت، چونکە ئەویش دۆستی هەن و ئیدی هەروا بەزنجیرە یەک بە دوای یەکدا.

پارچە

بێ دەنگی چاترە، لەوەی کە نابێ
چیت لە دڵدایە، کەسێ بیبیستێ
لە سەرچاوەوە، بەری ئاو بگرە
کە جۆگا پڕ بوو، کێیە بیبەستێ

خانە

قسەیەک بە نهێنی، کە نابێ بگوترێ
هەرگیز لەناو خەڵک، ناشێ بگوترێ

٨- ڕەوشت

دوژمنی بێ هێز کە دێتە ژێر بار و خۆی بە دۆست پێشان دەدا مەبەستی هەر ئەوەیە ببێتە دوژمنێکی بەهێز و توانا و گوتوویانە ئەوە پشت بە دۆستایەتی دۆستان نابەسترێ، چ جای دڵنیایی لە دەمەلاسکەی دوژمنان.

٤- پەند

ئەوەی دوژمنی بچووکی خۆی بە کەم بزانێ، وەک ئەوە وایە ئاگرێکی گڕی پشتگوێ خستبێ.

پارچە

ئەمڕۆ ئەتوانی، ئاگر خامۆش کەی
کە گەشایەوە، دائەگرێ جیهان
مەهێڵە دوژمن، دەست داتە کەوان
تۆ دایدرووە بە تیر، وەک تیک و دوورمان

٥- پەند

بەجۆرێک لە نێوان دوو دوژمندا بدوێ، کە ئاشتبوونەوە شەرمەزار نەبیت.

## پارچە

له نێوان دووکەس، شەڕ وەک ئاگرە
دوو زمان و شۆفار، داردەست هەڵگرە
کەینێ بوونەوە هەواڵ، هەردووکیان
شەرمەندە و ڕووڕەش، ئەبی لەناویان
لەناو دوو کەسا، ئاگر هەڵگیرسان
ژیری نییە خۆتی، لێ بدەی بەسووتان

## پارچە

بەسپایی بدوێ، لەگەڵ دۆستانت
تا گوێی لێ نەبێ، دوژمنی خوێنخوار
چی دەڵێی لەبن، دیوار وریابە!
نەک گوێیەک هەبێ، لەو دیوی دیوار.

٦- پەند

ئەوەی ئاشتی لەگەڵ دوژمنانی دۆستی خۆی ئەکا بیری ئازاردانی دۆستانی خۆی هەیە.

ئەی خاوەن هۆش، دەستت لەو دۆستە بشۆ
کە دائەنیشێ لەگەڵ، یەکە دوژمنانی تۆ

٧- پەند

ئەگەر لە بەجێهێنانی کارێکتدا دوودڵ بووی، ئەو لایەیانی هەڵبژێرە کە ئاسانتر دێ بەدەستەوە و ئازاری کەمترە.

خانه

بەتوندی لەگەڵ پیاوێکی نەرما مەکە گفتوگۆ
ئەوەی لە دەرگای ئاشتیشت ئەدا مەکە جەنگ و جۆ

٨- پەند

تا ئیش بە زێڕ و پارە پێک بێ، ناشێ گیان بخەیتە مەترسییەوە، عەرەب ئەڵێ (آخر الحيل السيف) واتە: دوای هەموو فێڵان ئەوجا نۆرەی شمشێرە.

خانە

کە دەست لە هەموو فێڵێک بوو بنبەست
ئەودەم ڕەوایە، شیر بگریتە دەست

٩- پەند

بەزەییت بەبێ هێزی دوژمندا نەیەتەوە، چونکە کە هاتەوە سەرخۆ و توانای پەیدا کردەوە، ئەو تۆ نابوێرێ.

خانە

کە دوژمنت بێ هێز دی، بەفیز سمێڵ بامەدە
مێشکە لەهەر ئێسقانێ و لە هەر کراسێ مەردە

٩- ڕەوشت

هەرکەسێک بەدێک بکوژێ، خەڵکی لەبەلای وی ڕزگار دەکات و کابرای بەدیش لە سزای خوا.

پارچە

بووردن کارێکی زۆر جوانە بەڵام
زامی خەڵک مەخە بەر ئێشی مەرهەم

نەیزانی ئەوەی ڕەحمی کرد بە مار
ستەم بوو کردی، لە کوڕی ئادەم

۱۰- ڕەوشت

بەگوێکردنی ئامۆژگاری دوژمن هەڵەیە، بەڵام گوێ لێ ڕاگرتنی ڕەوایە، تا بە پێچەوانەی ئەوەوە کار بکەیت و ئەمەش ڕاستییەکەیە.

دوو تاکی

لەوە بترسە دوژمن پێت بڵێ ئەوە بکە سادەی
ئەوەک بە دوو دەست لە ئەژنۆی ڕەقی پەشیمانیت دەی

گەر ڕێگای ڕاستی هەروەکو تیرت نیشان دا دوژمن
تۆ بەلای چەپدا وەربسووڕێوە، هەر دوو چاوی من

۱۰- پەند

تووڕەیی لە ئەندازە بەدەر ترس هێنە و نەرمیی ناوەختیش هەیبەت بەرە. نەهێندە تووڕە و تۆسن بە لێت بترسن نەهێندەش نەرم بە بەسەرتدا زاڵ بن.

دوو تاکی

نەرمش و توندی پێکەوە دانێ
وەک خوێنگر زام و هەتووان دائەنێ

پیاوی ژیر هێندە توندی ناگرێ
تا تووڕەییەکەی دنیا داگرێ

نە هێندەش نەرم و شلک و ناسکە
زوو بشکێتەوە بەو قۆڵ و باسکە

نە خۆی زۆر بەرز ئەگرێت و ئەڕوا
نە ئەکەوێتە بەر قسەی بێ پەروا

دوو تاکی

لاوێک بە باوکی، گوت پیاوی دانا
پەندێکم فێرکە، پەندی پیرانا
گوتی پیاوەتی، بکە تا دەتوانی
نەهێڵی گورگ لێت، تیژکا ددانی

١١- ڕەوشت

دووکەس دوژمنی وڵات و ئاینن: پاشای بێ سەبر و خواپەرستی بێ عیلم.

خانە

با پاشای وڵات نەبێ، شازادێکی فەرماندەر
کە بۆ خودای نەبێتە، بەندەیەکی فەرمانبەر

١١- پەند

لەسەر پاشا پێویستە کەمتر لە بەندەکانی خۆی توورە بێ و زیدەڕۆیی لە توورەبوونێدا نەکا بەسەریاندا، تا دۆستەکانی خۆی باوەڕ و متمانەیان پێی بمێنێ، ئاگری قین و توورەیی لە پێشدا لە خاوەنەکەی بەر دەبێت، پاشدان کە زمانەی کێشا ئەوجا دەگاتە دوژمن یا هەر نایگاتێ.

دوو تاکی

ناشێ ئادەمی، کە تۆ لە خاکی
بنێیە کەللەت، توندی و بێ باکی
تۆی هێندە توند و وا سەرهەڵگری
دیارە لە خاک نی، تۆ لە ئاگری

پارچە

لە شاری بەیلەقاندا[1]، سەرم لە عابیدێک دا
پێم گوت: بەزانینی خۆت، لە نەزانینم پاک کە

گوتی برۆ: وەکو خاک، ئارامگربە ئەی فەقێ
یاخۆ هەرچیت خوێندووە، تێکڕا هەمووی ژێرخاک کە

١٢- ڕەوشت

بەدخوو بە دەست دوژمنێکەوە گرفتارە، بچێتە هەر شوێنێک لە دەست سزای ئەو ڕزگاری نابێ.

خانە

گەر لە دەست دەستی جەفا، بەدخوو بچێتە ئاسمان
لە دەستی خووی بەدی خۆی، هەمیشە بەر بەڵایە

١٢- پەند

کە دیتت بەربڵاوی کەوتووەتە ناو سوپای دوژمنەوە، تۆ خۆت کۆکەرەوە، بەڵام کە دیتت ئەوان کۆکن تۆ بیر لە پەرت و بڵاوی و ناخۆشیی بکەرەوە.

پارچە

برۆ لەگەڵ دۆستانت، بەبێ غەمی دانیشە
کە لە نێو دوژمنانت هەڵاییسا هەرا و جەنگ

بەڵام هەرکە هەستت کرد، لەگەڵ یەکا هاودەنگن
دەست لەسەر کەوان دانێ و قایم بکە قەڵای سەنگ

١٣- ڕەوشت

کەینێ فێڵەکانی دوژمن سەریان نەگرت، زنجیری دۆستایەتیی ڕادەتەکێنێ و ئینجا

١. بەیلەقان: شارێکە لە ئێران لە میانی شێروان و ئازربایجان.

لەژێر پەردەی دۆستایەتیدا، کارێکی وا دەکات هیچ دوژمنێک نەیکردبێ.

١٢- پەند

سەری مار بە دەستی دوژمن پان کەوە، چونکە یەکێک لەم دوو کەڵکانەی لێوە سەر هەڵدەدا، ئەگەر دوژمن سەرکەوت ئەوە مارەکەت کوشت و ئەگەر مارەکەش سەرکەوت، ئەوە لە دوژمن رزگار بووی.

خانە

لە رۆژی جەنگ دڵنیا مەبە، لە دوژمنی بێ هێز
مێشکی شێر دەردەهێنێ، کە دەستی لە گیان بەردا

ئامۆژگاری

ئەگەر زانیت هەواڵێک دڵی کەسێک ئازار دەدا، تۆ مەیڵێ و لێی بێدەنگ بە، با یەکێکی تر بیڵێ.

خانە

بولبول موژدەی بەهار بێرە
هەواڵی بەد، بە کوند بسپێرە

١- پێشبینی

پاشای لە ستەمکار (خیانەت) ی کەس ئاگادار مەکە تا بە تەواوەتی دڵنیا نەبی، دەنا بۆ نەمانی خۆت تێ دەکۆشی.

هەڵبەست

قسە حازرکە، جا وەرە گوفتار
کە دیتت قسەت، وا ئەکاتن کار
گوتن لە گیانا کار ئەکا، بە دوان[1]
بەڵام خۆت بە پەند مەدە، بە زمان

---

١. دوان: قسە.

١٤-ڕەوشت

ئەوەی ئامۆژگاریی خۆ پەسندێک بکات، خۆی پێویستی بە ئامۆژگاریکارێکە.

١٤- پەند

تەفرەی دوژمن مەخۆ و بەخۆنازینی ستایش گۆیان مەکرە کە ئەم داوی ڕسقی ناوەتەوە و ئەو دامەنی چاوچنۆکی گرتووەتەوە.

١٥- ڕەوشت

پیاوی گەوج پێداهەڵدانی لا خۆشە، وەکو لاشەیەک لەلاقەوە فووی تێکەی قەڵەو دەرکەوێ.

پارچە

گوێ مەدە دەنگی مەدحی چاپلووسان
کە بە هەرزانی، سوودی لێت ئەوێ
گەر ڕۆژێ نیازێت نەگەیاندە جێ
دوو سەد قات هەڵەت دەژمێرێ لەوێ.

١٦- ڕەوشت

تا وتار خوێنێک ڕەخنەی لێ نەگیرێ قسەکانی پوخت نابن.

خانە

خۆت هەڵ مەکێشە، بە جوانی گوفتاری خۆت
بە ئافەرینی نەزان و یا بە پێی ئەفکاری خۆت

١٧- ڕەوشت

هەموو کەسێک ئەقڵی خۆی لا تەواوە و منداڵیی خۆی لا جوان.

پارچە

جوو و موسوڵمانێک کەوتنە گفتوگۆ
پێکەنین گرتمی لە مشتومڕیان

موسڵمان ئەیگوت: ئەگەر وا نەبوو
وەک جوولەکەیەک دەرچم لە جیهان

جوو ئەیگوت: سوێندێ بە تەورات ئەخۆم
وانەبێ بمرم، وەک تۆی موسڵمان

گەر لەسەر زەوی دانا نەمێنێ
کەس بەنەفامی خۆی نابا گومان

١٨- ڕەوشت

دە پیاو لەسەر خوانێک ئەخۆن، بەڵام دوو سەگ لەسەر کەلاکێک پێک نایەن. چاوبرسی بە جیهانێک هەر چاوبرسییە و کەچی پیاوێکی قانیع بە نانێک تێرە، دانایان گوتوویانە: هەژاری بە قەناعەت چاکترە لە دەوڵەمەندی بە سامان.

یەک تاکی

ڕیخۆڵەیی تەنگ ڕەنگە، بەنانە وشکێک پڕبێ
بەڵام سامانی دنیا، پڕ ناکاتن چاوی تەنگ

دوو تاکی

باوکم کە سووری ژینی تەواو بوو
ئەم تاکە پەندەی پێ گوتم و دەرچوو

شەهوەت ئاگرە، پارێزی لێ بکە
ئاگری دۆزەخ لە خۆت خۆش مەکە

بەرگەی ئەو ئاگرە سوورە ناگری تۆ
ئاو بەم ئاگرە دابکە ئیمڕۆ

١٥- پەند

هەر کەسێک لەکاتی تواناییدا چاکە نەکا، لە بێ تواناییدا سەختی ئەبینێ.

خانە

لە مــەردم ئازار، بەدبەخــتــتــر نیــیــە
لە لیــقــەومــانا، کــەس یاری نیــیــە

١٩- ڕەوشت

هەر شتێک زوو پەیدا ببێ، زۆر نامێنێتەوە.

پارچە

بیــســتم کــە گڵــی، ڕۆژهەڵات ئەکــەن
بەمـاوەی چل ســاڵ، بە کاســەی چینی
لە مــەردەشت ڕۆژێ ســەدی وا ئەکــەن
بۆیە لێــرە کــەم نرخــیـــان ئەبینی

پارچە

جــووجکە لە هێلکە دەرهات، لە ڕسـقی خــۆی ئەگــەڕێ
ئادەمـــیــــزاد نیـــەتی، تەمـــیـــز و ژیری و زانــین
ئەم کــە کــاتێ گــەورە بوو، بەهیچ شــتــێکی ناگــا
ئەو لە گــشت شت تێپــەڕی، بە گــەورایەتی و بە تین
ئاوێنە لە گــشت جــێــیـــەک، هەیە بۆیە بێ نرخـــە
لەعل دژوار دێتـــە دەست، بۆیە بەنرخــە و ســـەنگین

٢٠- ڕەوشت

کار بە لەسەرەخۆییەوە دێتە دەست، پیاوی بەپەلە زوو ئەکەوێ.

دوو تاکی

بەچاوی خـۆم دیم، لە چۆڵ و بیـابان
ئاهیستە[1] پێش کەوت، لە خۆشرۆی رەهوان

ئەسـپی رەهوانی خـۆشـرۆ مـایەوە
وشـترەوان هێدیش، هەر نەپسـایەوە

٢١- رەوشت

بۆ نەزان هیچ شتێک لە بێدەنگی باشتر نییە و ئەگەر ئەوەشی بزانیبایە نەزان نەئەبوو.

پارچە

فـەزڵ و کەمـاڵت، گـەر نیـیە وا باشـە
ئاگـات لە زمـانی خـۆت بێ لە زارا

پیاو هەر زمانی خۆی ڕیسـوای ئەکا
گـوێزی بێ کـاکڵ، سـووکـە لە بارا

پارچە

شـێـتـێک کـەرێکی مـەشق دائەدا
هـەر هـەوڵـی لەگـــەڵ ئەدا بە دایم[2]

دانایەک گـوتی: نەزان خـەریک چی
لەم کـارەت سڵ کـە، لە لۆمـەی لایم[3]

چوارپێ لە تۆوە قـسـە فـێـر نابێ
بێـدەنگی فـێـربە، تۆ لە بەهـایم[4]

---

١. ئاهیستە: لەسەرخۆ. یا ئەوەی هێدی هێدی دەڕوا.

٢. دایم: هەمیشە، بەردەوام.

٣. لایم: لائم: لۆمەکەر

٤. بەهایم: ئاژەڵ، چوارپێ.

دوو تاکی

وردە نەبێتــەوە یەکــێک لە جــوابدان<br>
زۆری بێ جێ دێت، گفتوگۆی لەقسان

وەرە یا قــســـەت ڕێک خـــە وەک دانا<br>
یاخـۆ بێـدەنگ بە، هـەروەکـو چوارپا

١٦- پەند

هەرکەسێک لەگەڵ لە خۆی داناتردا کەوتە بێنەو بەرەی قسان تا خەڵکی وابزانن ئەوکەسە دانایە، بابزانن کە نەزانە.

یەک تاکی

گەر یەکێک لە تۆ چاکتر کەوتە دوان<br>
چاتریش بزانی، لێی مەگرە ڕەخنان

٢٢- ڕەوشت

ئەوەی لەگەڵ بەدان هەستێ و دانیشێ، چاکی نابینێ.

دوو تاکی

گــەر فــریشـتــە لەگــەڵ دێو بکا دۆسی<br>
لێی فێر ئەبێ ترس و ستەم و دڵ پیسی

لە بـەدان بەدی نەبێ، فـــێــــر نـابی<br>
بۆ گـــورگ پێـــست دروونەوە هەر نابی

١٧- پەند

نهێنی عەیبی خەڵکی دەرمەخە، نەوەک ڕیسوابن و ناویان بزڕێ و تۆش بێ متمانە بیت.

٢٣- ڕەوشت

هەر کەسێ فێری زانست بوو و کاری پێ نەکرد وەکو ئەوە وایە گایەکی لە جووتیدا لێ خوڕێت و تۆو نەوەشێنێ.

٢٤- ڕەوشت

لە لەشی بێ دڵەوە خوا پەرستی ناکرێ و لە توێکڵی بێ ناوک و کاکڵەوەش کاڵا پەیدا نابێ.

خانە

زۆر باڵای جوانی ژێر پەچەو چارشێو
کە دەرکەوت ناسیت، پیرەژنەی دێو

٢٥- ڕەوشت

ئەگەر هەموو شەوێک "قەدر" ئەبوو، شەوی "قەدر" بێ قەدر ئەبوو

خانە

بەرد هەمووی لەعلی بەدەخشان بووایە
بەرد و لەعل ئەبوو یەک نرخیان بووایە

٢٦- ڕەوشت

نە هەر کەسێ بە دیمەن جوانە ڕەوشتیشی باش و دروستە، کار لە دەرووندایە، نەوەک لە پێستە.

پارچە

تۆ ئەتوانی بەیەک ڕۆژ تێبگەی خووی پیاو
کە گەیشتۆتە کوێ، لە پایەکانی علووم
بەڵام لە بیر و هۆشی ئەرخەیان مەبە و مەغروور
کە گیانی پیس بە چەندین ساڵ نابێ مەعلووم

٢- پێشبینی

ئەوەی بەگژ گەوراندا بچێ خوێنی خۆی ئەڕێژێ

پارچە

ئەگـــــەر تۆ زۆر خـــۆت بـە زل بزانـی
ڕاستیان گوت: خێل یەک ئەبینێ بە دووان
زوو نێـــــــــو چەوانـت، ئـەبـیـنـی شـکـا
کـە شــەڕە قــۆچت، کــرد لەگـــەڵ بەران

٢٧- ڕەوشت

پەنجە لەگەڵ شێر لێکدان و دەست بۆ شمشێر بردن کاری ئاقڵانە نییە.

خانە

شەڕ و زۆرەملێ مەکە لەگەڵ مەست
بەر لە سەر پەنجە، بخە باغەڵ دەست

٢- پێشبینی

لاوازێک لەگەڵ بەهێزێکدا زۆرانبازی بکا، یاری دوژمنە بۆ نەمانی خۆی.

پارچە

کـــەی ســـــایە پەروەر، توانـای هەیە
بێتـە مـەیدانی شـەڕکـەران لە جـەنگ
بازوو سست شێتە، کە پەنجە باوێ
ڕووبەڕووی پیاوی ئازا و ئاسن چەنگ

٢٨- ڕەوشت

هەرکەسێ گوێ لە ئامۆژگاری نەگرێت، حەزی لە سەرکۆنەکردنە.

خانە

کــە ئامــۆژگــاریت نەهاتە گــوێ

کە گلەم لێ کردی بێدەنگ بە لە جێ

١- گوتەی جوان

بێ هونەران چاویان هەڵنایە هونەرمەندانی پێ ببیـنن، هەروەکو سـەگی بەرەڵلا کە سـەگی ڕاوێی دیت، ئەیکاتە هەرا، بەڵام ناشـوێرێ بێتـە پێش. پیـاوی سـپڵـە کـە نەیتوانی دەرومستی هونەرمەند بێت، بە پیسییەوە ئەچێتە پێستیەوە.

خانە

پیـاوی سپڵە غـەیبـەتی خۆی هـەر ئەکا

چونکە کـاتی ڕووبەڕوو لاڵە زمــانی

٢٩- ڕەوشت

ئەگــەر ســـتــەم و ئازاری سک نـەبوایە، هیچ باڵندەیەک نـەئەکــەوتە نـاو داوی ڕاوچییەوە، بەڵکە ڕاوچی هـەر خۆی داوی دانەنابایەوە.

٣٠- ڕەوشت

دانایان درەنگ ئەخۆن و خواپەرستان نیوەتێر و زاهیدان مەمرە و مەژی و لاوان تا لەگـەن ئەگـرێ و پیـران تا ئارەقـە دەکـەنەوە و بەڵام ڕەند و قـەلەندەران ئەوەندە ئەخۆن تا هـەناسـەیان لێ دەبرێ و نان و ڕسقی کەس لەسەر سفرە نامێنێ.

یەک تاکی

بەندە و دیلی سـک، دوو شـەو ناخـەوێ

لەبـەر گـــەدەی پڕ، وە لە دڵ تـەنگی

٣١- ڕەوشت

پرسکردن بە ژنان ماڵ وێرانییە و دلاواییش لەگەڵ گەندەلاندا گوناهە.

خانه

دڵت بســـووتێ بە پڵنگی تیـــژ دان
بێ خــواییت کــردووە بەمــافی پەزان

١٨- پەند

ئەوەی دەسەڵاتی بەسەر دوژمندا دەشکێ و نەیکوژێ دوژمنی خۆیەتی.

خانه

بەرد لە دەستا بێ و ماریش لە سەر سەنگ
شـێـتـیـیـە ڕامـێنی، یا بکەی درەنگ

تاقـمێک بە پێچـەوانەی ئەمـەیانەوە بە بەرژەوەند زانی و گـوتیان لە کـوشـتنی دیلاندا ڕامـان و وردبوونەوە باشترە، لەبەرئەوەی ئیختیـارەکە هێشتا هەر ماوە لە کوشتن و نەکوشتندا، جا دەتوانی بکوژی یا نەکوژی و دەشتوانی ببەخشی، بەڵام ئەگەر بێ ڕاوەستان بکوژرێن لە وانەیە بەرژەوەندییەک لە دەست دەرچێ و جارێکی تر قەرەبوو نەبێتەوە.

دوو تاکی

ئاسـانە یەکێک لە گیان کەی بێ بەش
کــوژراو گــیــانی، نـاخــرێتــەوە لەش

لە مــەرجی ئەقڵی، تیر زەنە وەســتـان
هەرکـە تیـر دەرچوو، ناچێتـەوە کـەوان

٣٢- ڕەوشت

ئەگەر دانایەک لەگەڵ نەفاماندا تێوە گلا، ئەبێ بە تەمای ڕێز و شکۆمەندیی نەبێت و ئەگـەر نەفامـێکیش وە قسـە بێنی و بەسـەر دانایەکدا زاڵ بێ پێت سـەیر نەبێ چونکە بەردێکە و هەموو گەوهەرێکی ئەشکێنێ.

خانه

سـەیر نیـیـە گـەر دەرنـەبڕێ نەفـەس
بولبـولێک قـەلی، ببـتـە هـاو قـەفـەس

پارچە

گـەر هونـەرمـەندێک لەدەست ئەوباش ئازار ببـینێ
هەست بە ناخـۆشی ئەکـا، دڵی پڕ لە غـەم نابێ
بەردی بەد گەوهەر، ئەگەر کاسـەی زێڕین بشکێنێ
نرخی بەرد زیاد ناکـا و بەهای زێڕیش کـەم نابێ

٣٣- ڕەوشت

ئەگـەر دانایەک یا هۆشمـەندێک لە نێو هەرزەکـاراندا قـسـەی خـۆی بڕی سـەرت سوڕنەمێنێ، چونکە ئاوازی بوربوت[1] وە سەر دەنگی دەهۆڵ ناکەوێ و بۆنی عەنبەر لە بۆگەنی سیردا ون ئەبێ.

دوو تاکی

ملـی هـەڵبـــڕی دەنگ بـەرزی نـادان
کـــە دانـایـەکی، بـێ شــــەرم بـەزان
تۆ کــە نـازانی پـەردەی حـیــجــازی
لـەبەر تـەپڵـی جـــەنگ، نەمــا ئـاوازی

٣٤- ڕەوشت

گەوهەر بکەوێتە ئاودەستێشەوە هەر بەنرخ و بەهایە، هەروەها تۆز ئـەگەر بشگاتە ئاسمان هەروا سووک و بێ نرخە. پەروەردەی ناشایان جێی داخە و ماندووبوونی بەفیڕۆ چوونە، خۆڵەمێش بۆیە جێ بەرزە چونکە ئاگر گەوهەرێکی خوایییە بەڵام

١. بوربوت: ئامێرێکی مۆسیقایە

چونکە خۆڵەمیش خۆی هونەرێکی نییە هە روەکو خاکە، نرخی شەکر لەبەر ئەوە نییە کە لە قامیشە بەڵکە خۆی تایبەتمەندیی خۆی هەیە.

دوو تاکی

سروشتی کەنعان، بێ خێر بوو بێ بەر
نرخی بەرز نەکرد، بوونی پێغەمبەر

هونەر بنوێنە، نەک تیرە و پدەر
گوڵ نەوەی دڕکە و برایم لە ئازەر

٣٥- ڕەوشت
میسک ئەوەیە کە خۆی بۆن بدا، نەک وەکو عەتار ئەڵێ، دانا وەک قوتووی عەتار بێدەنگە و هونەرنما. نەزان وەک تەپڵی شەڕ دەنگ گەورە و بەتاڵ.

هەڵبەست

زانایەک لەناو، کەودەنان دابێ
ئابەم جۆرەیان، گوتووە دۆستان

وەک نەوجوانێک، لەناو کوێران بێ
یاخۆ قورئانێک، لەناو زەندیقان

٣٦- ڕەوشت
دۆستێکی کە بە عومرێک دەگیرێ، نابێ بە هەناسێکی بڕەنجێندرێ.

یەک تاکی
بەردێک بە چەند ساڵ ئەبێتە لەعل
نەکەی بە پشووێک، بیشکێنی بە بەرد

٣٧- ڕەوشت

ئەقڵ بەدەست نەفسەوە، وەک پیاوی گرفتارە بەدەست ژنی جەربەزەو حیلەبازەوە

خانە

ماڵئاوایی بکە تۆ، لە خۆشی و لە خانووێ
کە دەنگی ژنی تێدا، بەرز ئەبێتەوە لەوێ

٣٨- ڕەوشت

بڕیاری بێ هێز فرت و فێڵ و ئەفسوونە و هێزی بێ بڕیاریش نەزانین و شێتی.

یەک تاکی

پاکی و تەگبیر و ئەقڵ پێویستە، ئینجا موڵک و ماڵ
کە موڵک و دارای نەزان چەکێکن، بۆ شەڕی خودا

٣٩- ڕەوشت

جوامێرێک کە بخوا و ببەخشێ زۆر لە خواپەرستێکی چاکترە نەخوا و هەر داینێ. ئەوەی لەبەر خاتری خەڵک واز لە ئارەزووەکانی بێنێ ئەوە لە ئارەزووی حەڵاڵەوە کەوتووەتە ئارەزووی حەرامەوە.

خانە

عابیدێک گەر بۆ خودای نەکا، گۆشەنشینێ
بێچارە لە ئاوێنەی تاریکدا، چ ئەبینێ

کەم کەمە زۆر ئەبێ و دڵۆپ دڵۆپ دەبێتە لافاو، یانی ئەوانەی کە دەسەڵاتیان نییە و بێ هێزن، با وردە بەردان کۆکەنەوە، تا دەرفەت، ئەوسا دەماری پێ لە مێشکی دوژمن دەربێنێ.

هۆنراو

(دڵۆپ دڵۆپ لەسەریەک، کۆبێتەوە، ئەبێتە نەهر
ڕووبار لەگەڵ ڕووبارێک، کۆ بۆوە ئەبێتە بەحر)

خانە

کەم کەم پێکەوە، زۆر دێتە ئەژمار
دەنکە دەنکەیە، گەنم لە عەمبار

٤١- ڕەوشت

زانا نابێ بێ هۆشیی نەفامان بەحیلم و توانایییەوە بەسەر بەرێ چونکە بۆ هەردوو لایان زەرەرە، ئەو سامی نامێنێ و نەزانیی ئەویش پتەوتر دەبێ.

خانە

گەر لەگەڵ سپڵە بدوێی بەخۆشی
زیاتری دەکا، بەدی و سەرکێشی

٤٢- ڕەوشت

گوناه هەر کەسێک بیکا، ناپەسندییە و لە زانایانیشدا ناشیرینترە چونکە زانین چەکی شەڕی شەیتانە و کە خاوەن چەکیشیان بەدیلی برد شەرمەزاریی زۆرترە.

دوو تاکی

باشترە پیاوێک، نەزان بێ و هەژار
لە زانایەکی، نەکا پارێزکار

ئەو لەبەر کوێری، ڕێی کەوتە لاپاڵ
ئەم بە دووچاوان، ئەکەوێتە چاڵ

٤٣- ڕەوشت

گیان هەمووی هەناسەیەکە، جیهان بوونێکە لە نێوان دوو نەبووندا ئەوانەی دین بە دنیا دەفرۆش کەرن، "یوسف" ئەفرۆشن ئەدی چ ئەکڕن؟ (ألم أعهد اليكم يابني آدم أن لاتعبدوا الشيطان أنه لكم عدو مبين) واتە: ئەرێ ئەی بەنی ئادەم ئەدی پەیمانم لێ وەرنەگرتن شەیتانی نەپەرستن، خۆ شەیتان دوژمنێکی ئاشکرای ئێوەیە.

خانە

بە قـــســـەی دوژمـن ئـەتـۆ، پـەیمانـی دۆســـتـــیت شکاند

لەگەڵ دوژمن بووی بە دۆست و لەگەڵ دۆست دۆستیت پساند

٤٤- ڕەوشت

شەیتان دەروەستی دڵسۆزان و پاشاش دەروەستی هەژاران نایەن.

هەڵبەست

قـــەرد مـــەدە بەوەی کـــە نـوێژ نـاکـــا

با لـە هـەژاریـیـــا، دەمـی واڵا کـــا

ئەو فـــەڕزی خـــوا، نـەهێنێـتــە جێ

چۆن بۆ قـــەردی تۆ، دڵـی دائـەتـەپێ

٤٥- ڕەوشت

ئەوەی لە ژیانیدا نانی نەخورێ، کە مرد ناویشی نابرێ، تامی ترێ بێوەژن ئەیزانێ نەک خاوەن ترێ، یوسفی ڕاستگۆ - دروودی خوای لێ بێ لە ساڵی گرانیی "میسر" دا تێری نەئەخوارد، تا برسییەکانی لە بیر نەچێ.

دوو تاکی

ئەوەی کـــە ئەژی لە خـــۆشی و بۆنـە

نـازانێ حـــاڵی برســـیـــان چۆنـە

کەسێک ئەزانێ، حاڵی هەژاری
کە خۆی دیبێتی، دەردی نەداری

پارچە

ئەی ئەوەی کە سواری ئەسپی خۆشڕەوی، خێرا مەڕۆ
وا کەری زی کێشی مسکین، چوارپەلی چۆتە قوڕێ
تۆ لە بۆ ئاوردوو مەچووە، ماڵی دەروێشی هەژار
لەو کڵاوڕۆژنە ئەوە دوودی دڵە دێتە دەرێ

١٩- پەند

لە وشکە ساڵیدا لە دەروێشی بێ حاڵ و باڵ مەپرسە چۆنی؟ بەو مەرجە نەبێ کە مەرهەمێکی لەسەر برینی دابنێی و شتێکی بۆ ببریتەوە

پارچە

کە کەرێکت بە بارەوە دیت، کەوتۆتە قوڕێ
بەزەییت پێیدا بێتەوە و مەوەستە لەسەر سەری
بەڵام کەی ڕۆیشتی و لێت پرسی، چۆن کەوتووە
کەمەر ببەستە و وەک مەردان، بۆی بگرە کلکی کەری

٤٦- ڕەوشت

دووشت ناچنە ئەقڵەوە، خواردنی بەرلە دابەشکرانێ و مردنی ناوەخت و لەناکاو.

پارچە

چارەنووس قەت ناگۆڕێ، بەهەزار ئاهوناڵە
بەسوپاس یا بەگلەیی، بێتە دەرێ لە زاری
فریشتەی دیاریکراوی، سەر گەنجینەکانی با
باکی چرای پیرێژنێی، چییە وەرێ یەکجاری

٢٠- پەند

ئەی داواکاری مووچە و بەرات و بژێوی دانیشە تا بیخۆیت تۆش ئەی ئەجەل هاتوو مەڕۆ و ڕامەکە، گیان دەرنابەیت.

پارچە

کۆشش بۆ خۆراک بکەی یا نەکەی
هەر بۆت ئەنێرێ، خوای عەززە وەجەل

بکەویە زاری، شێر و پڵنگیش
ناتخۆن ئەمێنی، تا ڕۆژی ئەجەل

٤٧- ڕەوشت

دەست ناگاتە دانەندراو و دانراویش لە هەرجێیەک بێ دەست ئەیگاتێ.

خانە

بیستووتە سکەندەر چووەتە ناو تاریکی
دوای ئەم هەموو ڕەنجەش، ئاوی حەیاتی نەچەشت

٢١- پەند

ڕاوچی بێ رسق ماسی لە دیجلەدا ناگرێ و ماسیش بێ ئەجەل لە وشکاییە نامرێ.

خانە

هەژاری چاوچنۆک، بە دنیادا ڕائەکا
ئەو بەدوای رزق و ڕۆزییا و ئەجەل بەدوای ئەوا

٤٨- ڕەوشت

دەوڵەمەندی فاسق کەستەکێکی زێڕییە و دەروێشێکی چاک جوانێکی تۆزاوییە، ئەمیان کراسە پیناوییەکەی مووسایە و ئەوەی پێشینیش ریشی رازاوەی فیرعەون.

توورەیی و توندوتیژیی پیاوچاکان ڕوو لە ڕەوینەوەیە و دەوڵەتی پیاوخراپانیش سەر بەرەو نشێوە.

پارچە

ئەوەی کە خاوەن سامان و جێیە
یارمەتی کەسی دڵشکاو نادا
پێی بڵێ کە هیچ، سامان و جێیەک
کەڵکی ناگرێ، لە ئەو دنیادا

٤٩- ڕەوشت

حەسوود هەروەک لە بەخششەکانی خوا ڕژد و قرچۆکە، ئاواش دوژمنی پیاوی بێ گوناهە.

پارچە

زرە پیاوێکی مێشک وشکم دیت
کەوتبووە گیانی، پیاوی خاوەن جاه
گوتم: ئەی خواجە، تۆ زۆر بێ بەختی
خەڵکی خوا پێداو، چییانە گوناه

پارچە

نەکەی ئارەزووی بەڵا، بۆ حەسوود
کە ئەو بەدبەختە، بۆ خۆی بەڵایە
هیچ پێویست ناکا، دوژمنیەی بکەی
ئەو خۆی دوژمنی، خۆی وا لە دوایە

٥٠- ڕەوشت

سـوختـەی بێ ئامـانج عـاشـقـێکی بێ زێڕ و پارەیە و ڕێبـوارێکی نەشـارەزا و باڵندەیەکی بێ پەڕ و باڵە و زانای بێ کـردەوەش داری بێ بەرە. زاهیـدی نەزانیش خـانووی بێ قـاپی و دەرە و مـراز و مـەبەست لە هاتنە خـوارەوەی قـورئان، پەیداکردنی ڕەوشـتی باش و جوانە، نەک هەر خوێندنەوەی شێوەی نووسینەکانی. خواپەرستی نەزان ڕێبوارێکی پیادەیە و زانایەکی کردار سست و خـاو سوارێکی نووستووە. گوناهکارێکی تۆبەکار باشترە لە خواپەرستێکی بەخۆناز.

خانە

سەرهەنگێ چاترە، خۆش خوو و دڵدارێ
نـەک زانایـەکی، مـــــەردوم ئـازارێ

لە یەکێکیان پرسی: "زانای بێ کردەوە بە چ دەچێ؟ گوتی: "بە هەنگێکی بێ هەنگوین".

خانە

بە زەردەواڵەی دڵڕەق و ناپیـــاو بڵێ
کــە هەنگوینیش نادەی، پێـوە مــەدە

٥١- ڕەوشت

پیاوێ نێریەتی نەبێ ژنە و خواپەرستی چاوچنۆکیش ڕێگر.

پارچە

بۆ خۆ دەرخستن، کراسی سپی لەبەر
تا لای خەڵک چاک بی و نامەکەت سیا

دەست لـە دنیـــــایـە دەبێ هەڵگری
کـە دەســتت درێژە و بۆ خـۆشت کـۆتا

٥٢- ڕەوشت

دوو کەس حەسرەتیان لە دڵ دەرناچێ و پێی زیانی لە قوڕ چەقیویان نایەتە دەرێ، بازرگانێکی کەشتیی شکاو و میراتگرێکی هاودەمی ڕەندان.

پارچە

دەروێش پێیـــان ڕەوایە، خـــوێنی ئاڵت بڕژێنن
گەر نەیانتوانی دەستیـان بگاتە، ماڵ و سامانت

یان مەبە ئاواڵ لەگەڵ کەسانی کراس شینپۆش
یا دەستت بشۆ لە گشت سامان و بوون و مانت

یا دۆستـایەتی فیلەوانانی خاوەن فیل مەکە
یا دەبێ خانووت هێندە قـایم بێ، نەتەپێ بانت

٥٣- ڕەوشت

ئەگەرچی خەڵاتی سوڵتان بەنرخە، بەڵام کۆنە کراسی خۆت بەڕێز و بەنرختره و هەرچەندە خواردنی سەر سفرەی گەورانیش بە تامە، بەڵام وردە نانی نێو هەنبانەی خۆت بەتامترە.

خانە

سرکەی دەستی خۆت، لە تەکیا تەڕە
لە نانی خێر و گۆشت گا چاترە

٥٤- ڕەوشت

پێچەوانەی ڕێی ڕاست و دژی بیروڕای ئاقڵمەندانە، بە گومان دەرمان خواردن و بە نەشارەزایی و بێ کاروان ڕۆیشتن. لە "غەزالی"[1] پێشەوایان پرسی - ڕەحمەتی

١. غەزالی: (ئیمام محەمەد) لە زانایە ناودارەکانی پێچی (سەلجووقی)یە، لە ساڵی (٤٥٠)ی کۆچی لە طوس هاتووەتە جیهان. لە زانیاریدا، لە فقە و حیکمەت گەیشتووەتە پایەی (مجتهد) لە ساڵی (٤٨٤)ی کۆچی لەسەر خوازتەی (نظام الملك) لە مەدرەسەی نیزامیە لە بەغدا تەدریساتی کرد، پاشان چوار ساڵ کنارەگیری کرد، تالیفاتی گرینگی لێ بەجێ ماوە... - زەکی -

خوای لێ بێ - بە چی گەیشتییە ئەم پایەیە؟ گوتی: "بەوەی کە هەرچییەکم نەزانیبایە، شەرمم لە پرسینی نەئەکرد"

پارچە

ئومێدی شیفا هاتنت، ئەو دەمە ئاقڵانەیە
ئەو کەسە نەبزت بگرێ، کە سروشتت ئەزانی
چی نازانی بپرسە، چونکە هەر کەم پرسینە
ئەبتە رێگری پایە و زانینت بە ئاسانی

٢٢- پەند

هەر شتێکت کە زانی بۆت دەرئەکەوێ، پەلە لە پرسینی مەکە، کە بۆ سامی دەسەڵات زیانبەخشە

پارچە

کە "لوقمان" دیتی، لە دەستی داوود
بە پەرجوو[١] ئاسن، دەبێتەوە مووم
نەیپرسی ئەوە چی ئەکەی، چونکە
زانی بێ پرسین، لای ئەبێ مەعلووم

٥٥- رەوشت

هەرکەسێکی لەگەڵ خراپان هەستێ و دانیشێ، ئەگەر خووی ئەوانیش کاری تێ نەکا، بەکردەوەی ئەوانەوە تاوانبار ئەبێ، خۆ ئەر بۆ نوێژێش بچێتە کاولێک، هەر گومانی مەی خواردنەوەی پێ دەبەن.

---

١. پەرجوو: موعجیزە.

دوو تاکی

داغی نەزانیت، دانا لەسەر خۆت
کە نەزانێکت، هەڵبژارد بە دۆست

لە دانایانم، داوا کرد یەک پەند
گوتیان لەل[1] نەزان، خۆت مەکە پەیوەند

ئەگەر داناش بی، هەر کەرت ئەکا
خۆ گەر نەزان بی، شێتترت ئەکا

٥٦- رەوشت

هێمن و خۆڕاگری حوشتر وەکو زانراوە، ئەگەر منداڵێک ڕێشمەکەی بگرێ و بەدوای خۆیدا ڕای کێشێ و سەد فرسەنگی ببات، سەر وەرناگێڕێ و لە دووی دەڕوا، بەڵام ئەگەر خەرمند و دۆڵێکی مەترسیداری هاتە پێش کە ببێتە هۆی نەمان و لەناوچوونی و منداڵەکە بە نەزانی خۆی هەر ڕایکێشا، ئەوا ڕێشمە و جڵەوەکەی لە دەست ئەپسێنێ و چیتری بە دوادا ناچێ و لەگەڵیا ناڕوا، لەبەرئەوەی نەرمی لەکاتی توندیدا کارێکی ناشیرین و دزێوە و ئەڵێن: "دوژمن بە نەرمی نابێتە دۆست، بەڵکە تەمای دوژمنایەتییەی زیاتر دەکا".

پارچە

ئەوەی دڵسۆزیت ئەکا، ببە بەخاکی بەرپێی
گەر بە پێچەوانەشە، دوو چاوی پڕکە لە خاک

بە دڵسۆزی و لەسەرخۆ، مەدوێ لەگەڵ بەدخووا
ژەنگی کۆن بە مەورەدی، نەرم کە ناکرێ پاک

٥٧- رەوشت

ئەوەی لەقسەی کەسانی تردا هەڵداتێ تا بە گەورەی تێ بگەن پایەی نەزانینی تێ دەگەن.

---

١. لەل: لەگەڵ

پارچە

پیـــاوێ زیرەک بێ، جـــواب ناداتـەوە
هەتا نەزانێ، لێی کـراوە پرسـیـــار
گەرچی قسـەکەی ڕاست و ڕەواش بێ
خـەڵکی وەک مـەحـاڵ بۆ ئەخـەنە کـار

٥٨- ڕەوشت

برینێکم لەبن کراسـیدا هەبوو، شێخ - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - هەموو ڕۆژێ لێی ئەپرسیم، کە چۆنە؟ و نەی ئەپرسی لە کوێیە؟ زانیم خۆی لە ناوهێنانی شوێنەکەی ئەپارێزێ، چونکە ناوهێنانی هەمـوو ئەندامـێکی لەش ڕەوا نیـیـە و ناگـوترێ، ئاقڵمەندان گوتوویانە: ئەوەی قسەکانی پێش گوتنێ کێشانە نەکا، لە وەڵامەکەی دەڕەنجێ و دڵی دێشێ.

پارچە

تاچاک نـەزانی، کـە قسـەکـانت ڕاست و بەجـێنە
دەبـێ بۆ گـــــوتن، نـەکـــــەیتـــــەوە زار
لە ڕاسـتی گوتنا، دەستـەوەسـتـانیش تۆ دابمێنی
لەوە چاکـــتـــرە، درۆیەک بتکا ئازاد و ڕزگـــار

٥٩- ڕەوشت

درۆکـردن وەک برینـێکی گـەورەیە، ئەگـەر چاکیش بێـتـەوە، شـوێنەوارەکـەی هەر ئەمـێنـێ، نابینی کـە برایەکـانی "یوسـف" - سـەلامی خـوای لێ بێ - بـە درۆیەکی مـتـمـانەیان نەمـا (قـال بل سـولت لکم أنفسکم أمـراً) باوکیـان پێی گـوتن: ئێـوە نەفستان دنەی کارێکی دان.

پارچە

کـــەسێ خـــووی لەســـەر، ڕاســـتی گـــوتن بـێ
ئەیبـــــوورن ئەگـــــەر، هـەڵەی کـــرد جـــارێ

بـەڵام کـــــــــــــە نـاوی، بـە درۆزن دەرچـوو
مــتـمــانەی ڕاسـتی، قــســەی دێتـە خــوارێ

٦٠- ڕەوشت
گەورەترینی هەموو کائینات، ئادەمیزادە و نزمترین بوونەوەریش سەگە و بە بۆچوونی هەموو ئاقڵمەندانیش، سەگێکی بە ئەمەک چاکترە لە ئادەمیزادێکی سپڵە و ناسوپاس.

پارچە

سـەگ گـوێچکەی نانێک، ناکا فـەرامۆش
گەر پێی دابدەی، سەد جار، کوچکە سەنگ
بەڵام تەمەنێک، دڵی سپڵەیەک بلاوێنیەوە
لەسەر شـتـێکی، کـەم لێت دێتـە جـەنگ

٦١- ڕەوشت
هەوەسباز کردەوەی چاکە ناچێنێ و بێ هونەریش نابێتە سەروەر.

پارچە

بەزەییت نەیە، بە گـای زۆر خـــۆرا
کـە هەر ئەخـوات و ئەنوێ لە خـۆرا
ئەگـەر ئەشـتـەوێ، وەک گا قـەڵەوبی
ئەبێ بۆ جـەوری، خـەڵکی وەک کـەربی

٦٢- ڕەوشت
لە ئینجیلدا هاتووە، ئەی کوڕی ئادەم ئەگەر ماڵ و سامانت بدەمێ، بە ماڵ ئاگات لە من ئەبڕێ و ئەگەر هەژاریشت بکەم ئەوا بە دڵتەنگییەوە دائەنیشی، ئەدی شیرینی یادی منت کەی دەستگیر دەبێ و کەی پەلە لە پەرستنی من دەکەی؟

پارچە

گاوێک مەغروور و یەک غافڵ بە ماڵ
لە نەبوونیتا، دەستکورتی و غەمبار
گەر حاڵی خۆشی و ناخۆشیت وابێ
کەی ڕوو ئەکەیتە، خوای پەروەردگار

٦٣-ڕەوشت

ویستی خوای بێ چوون، یەکێک لەسەر تەختی پاشایەتی ئەهێنێتە خوارەوە و یەکێکی تر لە زگی ماسییا ئەپارێزێ.

خانە

خۆشە بۆ کەسێ کە ناوی خوای هەر لەگەڵدا بێ
با وەک یونسیش خۆی لە ناو زاری نەهەنگیدا بێ

٦٤- ڕەوشت

گەر خوا تیغی تووڕەیی دەرکێشێ پێغەمبەر و پیاوچاکان هەموو سەر دائەنەوێنن، خۆ ئەگەر ئاوڕێکی نەرمونیان بداتەوە بەدکاران دەگەیەنێتە پلەی چاکان.

پارچە

گەر لە حەشرا بە تووڕەیی لەگەڵمان بدوێ
پێغەمبەران کەی دەرفەتی، شەفاعەتیان ئەمێنێ
گەر لە ڕووی لوتفیشەوە، پەردە وەلادا
ئەشقیا سەر هەڵدێننەوە، بەهیوای بەخشینێ

٦٥- ڕەوشت

ئەوەی بە سزای دنیا ڕێی ڕاست نەگرێت تووشی سزا و ناخۆشییەکانی دنیای تر دەبێت، خوای گەورە فەرموویەتی:

(ولنذيقنّهم من العذاب الادنى دون العذاب الأكبر) واته: ئێمە ئازارە کەمەکەیان بەر لە ئازارە گەورەکە پێ دەچێژین.

یەک تاکی

پەند هەر دووانی بەکەڵکە، لەپاشان کۆت و بەند دێ
کە پەندیان دای و نەتویست، ئەتخەنە کۆت و بەندێ

٦٦- ڕەوشت
پیاوچاکان لە پێشینانەوە پەند وەردەگرن بەر لەوەی وەک ئەوان تووش بن. دزان دەست کورت ناکەنەوە، تا دەستیان کورت نەکەوە.

پارچە

مەل ناچێتە سەر، دانە و داوی دیار
کە دی مەلێکی، تر کەوتۆتە بەند
پەند لە بەدبەختی، خەڵکی وەرگرە
هەتا وەرنەگرن، ئیکە لە تۆ پەند

٦٧- ڕەوشت
ئەوەی کە گوێی ویستیان بە گرانی دروست کردووە، چ بکا تا ببیسێ؟ و ئەوەی کەمەندی بەختەوەرییەی لە دەست دەکێشن چ بکا تا لە دەستی دەرنەچێ؟

پارچە

شەوێکی تاریک، بۆ دۆستانی خوا
ڕووناکی ئەدا و وەک ڕۆژ ئەدرەوشێ
بەختەوەرییەک نییە، بە زۆری بازوو
تا خوای بەخشندە، نەیدا و نەیبەخشێ

چوارینه

لەلای کێ شکایەت کەم؟ کە دادوەری تر نییە
لە دەستی تۆش بەولاوە، دەستی باڵاتر نییە
ئەوەی تۆ شارەزای کەی، دیارە کەس ونی ناکا
ئەوەی کە تۆش ونی کەی، هیچ کەسی ڕێبەر نییە

٦٨- ڕەوشت

گەدایەکی ئەنجام باش چاکترە، لە پاشایەکی بەدئەنجام.

خانە

پێش شادمانی، غەمێ بکێشی
نەک لە دوای شادی، ئاخان هەڵکێشی

٦٩- ڕەوشت

زەوی ڕێژنە لە ئاسمان وەردەگرێت و ئاسمانیش تۆز و خۆڵ لە زەوی (کل أناء یترشح بما فیه) هەر قاپە ئەوە تەڕاوش دەکا (دەدەڵێنێ) کە تێیدایە.

خانە

ئەگەر خووی ئێمەت، زۆر لە لا بەدە
ئەتۆ خووی باشی، خۆت لە دەست مەدە

٧٠- ڕەوشت

خواوەندی گەورە و بەرز سووچان دەبینێ و دەپۆشێ، کەچی هاوسێ ناشبینێ و دەخرۆشێ

خانە

پەنا بەخوا، کە خەڵک غەیبیان ئەزانی
کەس نەیدەما، لە دەست یەکتر ئەمانی

٧١- ڕەوشت

لە کانگەدا زێڕ بە هەڵکەندن دێتە دەر و لە دەست قرچۆکیش بەگیان کەندن.

پارچە

قرچۆک ناخۆن و کۆیان هەڵ ئەخەن
ئەڵێن هەر ئومێد، باشترە لە خواردن
ڕۆژێک ئەبینی، بە کـــامی دوژمن
زێڕ ماوە و قرچۆک، چۆتە پای مردن

٧٢- ڕەوشت

هەر کـەسـێک بەزەیی بە ژێردەسـتـاندا نەیەتەوە، دووچاری ئازاری زەبردەسـتـان دەبێ.

دوو تاکی

نەهـەر بازوویەک، کـە هێـزێکی بوو
ئەبێ بشکێنێ، لە بێ هێـزێ دەست
دڵی بێ نەوا، قـــەت مــــەدە ئازار
ڕۆژێ ئەکـــەویە، بەر هێـــزی زۆردار

١- سەرگوزەشتە

دەروێشێک ئاوا ئەناورایەوە: "خوایە بەزەییت بەخراپاندا بێتەوە" کە خۆت ڕەحمەت بە چاکان کردووە و بە باشیت ئافەریدە کردوون.

٧٣- ڕەوشت

کە پیاوی ئاقڵ تەنگوچەڵەمەیەکی هاتە پێش، خۆی لێ بە دوور دەگرێ و لە جێی خۆیدا لەنگەر دەگرێ، چونکە سەلامەتی لە کەنارە و لێرە خۆشیی لە خۆی ئەبینێ.

٧٤- ڕەوشت

قومارچی سێ و شەشی ئەوێت، کەچی هەر سێیەکە هات.

خانە

هەزار جـــار لەوەڕ، خـــۆشـــتـــرە لە مـــەیدان
بەڵام کوا ئەسپ، بە دەست خۆیەتی هەوسار و جڵەو

٧٥- ڕەوشت

یەکەم کەسێک کە دەستپێشخەری کرد و ئەنگوستیلەی لە دەست کرد "جەمشید" بوو، لێیـان پرسی: "ئەوە بۆچی جـوانیت دایە دەسـتی چەپ و کـە گـەورەیی ڕاستەقینە هەر بۆ ڕاستەیە؟ گوتی: دەستی ڕاستە جوانی ڕاستەقینەی خۆی بەسە."

پارچە

فـەرمیدوون گـوتیـە نەقـقـاشـانی چین
لە خـوار داوێنی، چادرەکـەی بنووسن
لەگەڵ "بەدان" دا، باش بە ئەی هۆشیـار
کە چاکان خۆیان، گەورە و خۆشبەختن

٢- سەرگوزەشتە

لە گەورەیەکیان پرسی: "لەگەڵ ئەو هەموو گەورەییەی کە دەستی ڕاست هەیەتی، بۆ ئەنگوستیلە هەر لە دەستی چەپ دەکەن؟ وەڵامی دایەوە "ئەی نازانی کەسانی لێهاتوو هەمیشە بێ بەشن؟"

خانە

ئەوەی ڕسکاندی، خـۆشـی و هـەژاری
یـان بەخـت ئەدا، یا بـەخـــتـیـــاری

٧٦- ڕەوشت

ئەو کەسە دەتوانێ بێ ترس ئامۆژگاری و پەندی پاشایان دابدا، نە ترسی سەری هەبێ و نە تەمای زێڕ.

دوو تاکی

چ زێڕ بڕێژیە، بەو پێی خـــودانـاس
یا شـیری هیندی، لەسەر ڕاگری ڕاس
نە ئومێد، نە باکیان، ئەبێ لە هیچ کەس
ئەمـەیە بناغـەی، خـوا پەرسـتی و بەس

٧٧- ڕەوشت

شا بۆ نەهێشتنی ستەمکارانە و پۆلیس بۆ خوێنخـواران و قـازیش بۆ بیسـتنی سکاڵایانە لە دزان، بەڵام دوو دوژمنی بەحەق ڕازی، هەرگیز ناچنە بەردەمی قازی.

پارچە

کـــە دیتت دەبێ، بیـــدەی ئەو حـــەقـــەی کـــەوا لـەســـەرتە
بە خۆشی بیدەی یەکجار چاکترە، نەوەک بەهەراو جەنگ و دڵتەنگی
گـــەر کـــەســـێک بـاج و خـــەراجی نـەدا، بە ڕەزامـــەندی
بەزۆرەملێ هەر لێی دەستێنن، لەگەڵ هەقدەستی کاکی سەرهەنگی

٧٨- ڕەوشت

هەموو کەسێک ددانی بە ترشی ئاڵ دەبێتەوە، قازییان نەبێ بەشیرینی.

خانە

قازی گەر بەرتیل بخوا، پێنج خەیار
بۆت دادەتاشێ جێی دە بێستانزار

٧٩- ڕەوشت

سۆزانیی پیر ئەگەر تۆبە لە نابەکارییە نەکات چ بکات و پۆلیسی دەرکراویش لە مەردوم ئازارییە؟

خانە

لاوێکی گوشەنشین، شێرێکی ڕێی خودایە
پیرێک لە گۆشەیەکدا، کلۆڵی دەست و پایە

خانە

لاو ئەبێ زۆر بەهێزبێ، تا خۆی دوورکا لە شەهوەت
پیر خۆی ئارەزووی سستە، بۆی ڕاست نابێتەوە ئالەت

٨٠- ڕەوشت

لە دانایەکی ناوداریان پرسی، زۆر درەختی بەرز و بڵندو بەردار هەیە کە خودای گەورە ڕسکاندوونی و هیچیشیان، لە داری سەروو بەولاوە پێیان نەگوتراوە ئازاد و بەریش نادا، هۆی ئەمە چییە؟ گوتی: "هەر درەختە و دەرخۆری وەرزێکە بۆ بەردان، هەندێک جار بەو وەرزانە تازەو گەشن، کە وەرزەکەش بەسەرچوو ئەوە سیس و ژاکاون. بەڵام سەروو لەو دار و درەختانە بەدەرە و هەموو کاتێک و هەمیشە هەر سەوز و گەش و جوانە، ئەمەش هەر خوو و خدەی ئازادانە.

پارچە

دڵ مەبەستە بەوەی کە دەڕوا، دیجلە زۆر
لە پاش خەلیفەکانیش، تێپەڕیوە لە بەغداد

ئەگەر تۆ لە دەستت دێ، وەک دارخورما چاوتێربە
گەر لە دەستیشت نایە، وەک سەروو ببە ئازاد

٨١- ڕەوشت

دوو کەس بە حەسرەتەوە مردن: یەکێکیان ئەوەی هەیبوو نەیخوارد و ئەوەی تریان زانی و نەیکرد.

پارچە

کەس بەو جۆرە نابینێ، پیاوی قرچۆک بە مەزنی
لە کەم و کورتییەکانی بدوێت و بۆی تێ کۆشێ

بەڵام ئەگەر چاو تێرێک دوو سەد گوناهی هەبێ
سەخاوەت و بەخشینی، عەیبەکانی ئەپۆشێ

کتێبی گوڵستان بە پشتیوانییە خوای، کە یارمەتی و هاریکاری هەر لەو دەخوازرێت، تەواو بوو. هەروەک ڕەوشتی دانەرانیشە، لە هیچ نووسەرانێکی پێشینە نەخوازراوەتەوە و شیعرەکانی لە کەس وەرنەگیراون.

هۆنراو

کۆنە شرەی خۆت، بۆ خۆ جوانکردن
چاترە لە کراسێک، بۆی بکەویە خواستن

زۆرینەی وتەکانی سەعدی شادی هێن و دڵخۆشکەر و جووڵێنەرن و خۆشییان تێکەڵە و کورت بینانیش بەم هۆیەوە زمانی سەرکۆنە و تان و تەشەریان درێژ کردووە کە بەبێ سوود مێشکی سەربردن و دووکەڵی چرا هەڵمژین، کاری ئاقڵان نییە، بەڵام بۆ بیرو هزری ڕەوشەنی خاوەن دڵان، کە رووی قسە و وتاران لەوانە، شاراوە نییە کە دوڕی پەند و ئامۆژگاریی تێدا کێشراوەتە ناو تانوپۆی هەودای بڕگە و بابەتەکانیەوە و دەرمانی تاڵی ئامۆژگاریشمان تێکەڵ بە هەنگوینی وتاری جوان کردووە تا بیرو مێشکی خوێنەری پێوە ماندوو نەبێ و لە سامانی

وەرگرتنیش بێبەش نەبێ (الحمدلله رب العالمین) سوپاس بۆ خودای پەروەردگاری دنیایە.

دوو تاکی

ئامـۆژگـاریمان، لەجـێی خـۆیداکـرد
ڕۆژگــارانێکمــان، تێـدا بەســەربرد

گـــەر نەهاتە گـــوێی، ئارەزووی هـیـچ کـــەس
لای پێــــغـــــەمــــبــــەران، گــــەیاندنە و بەس

(ئەی خوێنەری. کتێب، بەزمیی تەنیا لە خوا بخوازە
بۆ لێــبــوردنی کــۆکــەرەوەی و بۆ خــاوەنەکــەی

هەر چییەک چاکە لەوەی کە بۆ خۆت ئارەزووت لێیە
دوای هەمووان داوای بەخشین کە، لە بۆ نووسەرەوەکەی

گەر من لە ڕۆژی رابوون هەڵێکم دەست بکەوتبایە
لای ئەو دڵسۆزە، دەمگوت ئەی گەورە و سەروەری ئێمە

گوناهکارەکە منم ئەی گەورەی هەموو خێرخوازان
چی خراپەیە هەمووم کردووە هاتووم خوازیاری بەد بەخشینێمە)

خانە

سوپاس بۆ خودا، کە ئەم کتێبە دوایی هات
پێش ئەوەی ژیانی من، بە کـــۆتا بگات

کۆ: ١٩٦٧/٤/٢٢

## پێڕست



# Gulistan

**Sheikh Moslehadin Saadi Shirazi**

*Translated by:*
**Zaki Ahmed Hanari**

چاپخانەی



هەولێر - کوردستان
Aras Press
Kurdistan - Erbil

